پێشکەشە بە: سەیران

ناوی کتێب: زیندانی گەڤەڕ– داستانێکی واقعییە
نووسینی: سەلام عەبدوڵڵا
بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٧١٢
پیت لێدان: ئەڤین محەممەد
هەڵەگری: فەرهاد ئەکبەری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید
دەرهێنانی بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی دووەم، هەولێر – ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ٩٣٦ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

**خوێنەری بەڕێز:**

ئـەم داستـانـە ڕووداوێکی ڕاستەقینـەیە کە لـە کۆتـاییی ساڵی ١٩٨٧ و سەرەتـای ساڵـی ١٩٧٩دا ڕووی داوە. کـەسایـەتـی و ڕووداوەکـانـی هەمووی واقعین.

سەر لە بەیانی پێنجی دیسەمبەری حەفتا و هەشت، جموجوڵێکی زۆر چالاکانە لە دۆڵی (نیوزەنگ)دا، هەست پێ دەکرا، قاچاغچییەکان کە ماوەی پانزە ڕۆژ بوو، لە ترسی شەڕ، نەیاندەوێرا توخنی دۆڵەکە بکەون، هەر شەوەکی بارەکانیان، لە نێو دۆڵەکەدا، خستبوو، چاوەڕوانی سەردانی پێشمەرگە و دانیشتوانی ئەو ناوە بوون. هێرشی دڕندانەی سوپای عێراق بۆ سەرملەکانی شێنێ و سەری مامەندە، پاش نۆ ڕۆژ، بەتێك شکێندراو پاشە و پاش گەڕایەوە بۆ مۆڵگاکانیان لە سەربازگەکانی (سونێ) و دەشتی قەڵادزێ. ئەوەی کە تەواو جێی سەرسووڕمان بوو لامان، ئەوە بوو کە لە ماوەی ئەو نۆ ڕۆژەدا، دوای ئەو شەڕە خەست و نابەرامبەرە، یەك پێشمەرگەش زامدار نەبوو، کەچی سەربازەکانی دوژمن، هەر لە ترسا، (٢٠)یان ڕۆحیان دەرچوو بوو، لاشەکانیشیان، لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا، بەجێ مابوون.

تەنیا شتێ کە سوپای عێراق توانیی لەو شەڕەدا بیکا، ئەوە بوو کە مەخفەرەکەی (شینێ)، کە چەند ساڵێ بوو، چۆڵ کرابوو، بتەقینێتەوە و لەوەشدا چوار سەربازی خۆی کە لە کاتی تەقینەوەکەدا – لە تەنیشت دیواری مەخفەرەکەوە خۆیان مەڵاس دابوو، لە دەست بدا.

چێشتەنگاو وڵاخدارەکەمان حازربوو، ئێمەش، من و برادەرێکی عەرەب، کە چەند مانگ لەوەوپێش گەیشتبووە لامان، تەواو خۆمان ئامادە کرد و بەرگی ئاساییمان پۆشی.

پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ وڵاخدارەکە پێی وتم، کە چاتر وایە ڕیشم – کە ماوەی دوو ساڵ بوو هێشتبوومەوە – بتاشم، چونکە بەئێراندا تێ دەپەڕین و ڕیشی زۆریش نیشانەی پێشمەرگایەتییە، بۆیە منیش سەرنجەکەیم – بێ دوودڵی – پەسند کرد و دەستبەجێ گەڕامەوە بۆ بنکەکەی خۆمان و ڕیشم پاك تاشی.

لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرەتای مانگی دوانزە بوو، کەچی دنیا زۆر خۆش بوو، هەتاو بەڕادەیەك گەرم بوو کە شەختە بەستووەکانی نێو دۆڵەکەی بەزوویی کردبووەوە و، تێکڕا قەراغی چەمەکەی «نیو زەنگ»ی کرد بووە قوڕ و لیتە.

پێش نیوەڕۆ کەوتینە ڕێ، وردە وردە بەسەر شاخەکەی بەردەمی «نوکان»دا هەلزناین، وڵاخدارەکە جڵەوی وڵاخی برادەرەکەمی ڕادەکێشا، کاتێ گەیشتینە سەر لووتکەی شاخەکە، بۆ دواین جار، ئاوڕێکم لە (نێو زەنگ) دایەوە خانووە قوڕینەکانی بەئاستەم بەدی دەکران، تەنیا شتێ کە بوونی ژیانی لەو دوڵەدا دەسەلماند، دوکەڵکێشی زۆپای خانووەکان بوون، کە دوکەڵێکی چڕ و خەست و سپییان لێ بەرز دەبووەوە.

ئێمە بەحیساب هاتبووینە ناو ئێرانەوە، بۆیە بە هاوەڵەکەم وت:

– «هیچ هەستت بەسنوور کرد؟»

ئەو ڕاچەنی و زۆر بەسەرسووڕمانەوە ئاوڕی لێ دامەوە و وتی.

-«سنووری چی؟»

ڕاستی دەکرد، چونکە هیچ دیار نەبوو کە نیشانەی سنووری دوو دەوڵەت بێ، هیچ شتێ جیاواز نەبوو، هەمووی لە یەك دەچوو، هەمان زنجیرە شاخ، یەك سروشت، عەینی ئاووهەوا، ئەوە سەرەڕای ئەوەش کە کەسمان نەهاتە ڕێ، بۆیە ئەویش ناهەقی نەبوو کە هەستی بەهیچ شتێ نەکردبێ، دیارە منیش هەر مەبەستم ئەوە بوو کە نیشانی دەم مەسەلەی سنوور شتێکی دروست کراوە و کوردستانیش یەك خاکە و یەك سەرزەمینی یەکگرتووە بۆ گەلی کورد.

وڵاخەکان بەلاڕێدا ڕووەو سەرەوە تەکانیان دەدا، کاتێ گەیشتینە سەر شاخەکە دیمەنێکی گەلێ دڵڕفین و سەرسووڕهێنەرمان هاتە پێش چاو، بەفری سەر شاخەکە لەبەر تیشکی خۆر دەبریسکایەوە کەبەڕادەیەك ئاوی چاوی دەبرد. لەوە دەچوو ئێمە یەکەمین ڕێبوار بین کە بەسەر ئەو بەفرەدا بڕۆین، چونکە هیشتا نەشکێنرا بوو و لە هیچ لایەکیشەوە جێ پێ بەرچاو نە دەکەوت.

تێکڕا دیمەنەکەی بەردەممان لە تابلۆیەکی خەیاڵاویی دەستی هونەرمەندێکی ڕۆمانسی دەکرد، بەتایبەتی گەڵای مس ڕەنگی کۆتایی وەرزی پایز کە تاکوتەرا بەدار و دەوەنەکانەوە هێشتا مابوون و ئەوەش ئەوەندەی تر جوانی و هێمنی و قودسیەتی دابوو بەسروشتی ڕەنگینی دەوروبەرمان.

ورده ورده بەشاخەکەدا داگەڕاین و لە قووڵایی دۆڵەکەی بەردەمماندا، دێیەکی خنجیلانە بەدی دەکرا بۆیە بەوڵاخدارەکەم وت.

– مامە ئەم دێیە ناوی چییە؟

ولاخدارەکە بێ ئەوەی ئاورمان لێ بداتەوە، بەدەنگی بەرز وتی:

– قوریان ئەوە دێی «کانی زەردە».

ئەمەی وت و پاشان ڕاوەستا و ڕووی کردە من و وتی:

– کاکە بەو برادەرت بڵێ ئاگای لە خۆی بێ و توند دەست بەکورتانەکەوە بگرێ، نەکو بکەوێ، چونکە ڕێگە لێژ و سەربەرەوخوارە...

منیش ڕاستەوخۆ ئەو قسانەم بۆ هاوەڵەکەم کرد بەعەرەبی، ئەوەی باش بوو هەر زوو پێم وتبوو کە من عەرەبی تەواو نازانم، بۆیە ڕەخنە لە قسەکانم نەگری. ئەوی ڕاستی بێ – لەگەڵ سادەیی ئەو ڕستەیەشدا – هەر زۆری ویست تا توانیم تەرجومەی بکەم، هەرچەند وشەی کورتانم هەر بۆ نەکرا بەعەرەبی. ولاخەکان زۆر بەزەحمەت بەو سەرەو لێژییەدا، دادەگەڕان، منیش هەرخەمی هاوەڵەکەم بوو کە زۆر نەشارەزا بوو لە سواریدا، بەڕادەیەك کە جامانەکەی سەری نیوەی هاتبووە سەرچاوی و نیوەکەی تریشی بەلاملیدا تلیسا بووە، کەچی ئەو بەهیچ شێوەیەك نەیدەوێرا دەستی کە توند لە کورتانەکەی گیر کردبوو– بەربدا و جامانە شێواوەکەی سەروچاوی چاك بکات.

هەر چۆنێك بوو ولاخەکان بەسەلامەت داگەرانە خوارێ و پاشان بەتەختایی بەردەم دێی «کانی زەرد» دا کەوتینە ڕێ. پێش ئەوەی بگەینە ناو دێ ولاخدارەکە ڕایگرتین و پێی وتین.

– ئێستە ناچارین بەناو دێی «کانی زەردا» بڕۆین، جا دەبێ زۆر بێدەنگ بین، چونکە «پاسگا» و سەربازی ئێرانی لێیە.

بەسەرسووڕمانەوە تۆزێ ڕوانیمە ولاخدارەکە پاشان وتم:

– باشە ڕێی تر نییە پێیدا بڕۆین و تووشی ئەمانە نەبین. خۆت دەزانی ئێمە پێشمەرگەین و نامانەوێ تووشی دەردی سەری لابەلایی بین...

ولاخدارەکە سەری ڕاوەشاند و وتی:

– ئەبراکەم، هیچ مەترسیتان نەبێ، ئەوانە هەقیان تەنیا بەسەر کەر و بارەوە هەیە، نە بەسەر سەڵتەوە...

کەوتینەوە ڕێ، کە سەرنجم دا، سەیر دەکەم هاوەڵەکەم هێشتە هەردوو دەستی لە پشتەوە توند بەکورتانەکەوە گیر کردووە و جامانەکەشی تەواو هاتووەتە خوارێ و لە ملی ئاڵاوە، بۆیە بەئەسپایی، پێش ئەوەی بگەینە ناو دێ، وتم:

– برام دەستەکانت بەکورتانەکە بەردە و جامانە شێواوەکەت بەباشی بپێچەرەوە، چونکە بەناوی دێدا تێ دەپەڕین، با سەرنجی سەربازەکانی ئیرانیش، لە هیچە، ڕانەکیشین...

هاوەڵەکەم کە گوێی لە قسەکانم بوو، کەمێك شڵەژا و پاشان یەکسەر دەستی لە کورتانەکە بەردا و جامانە شل و شێواوەکەی بێدەنگ، نەشارەزایانە، پێچایەوە.

کاتێ گەیشتینە ناو دێ، ولاخدارەکە بە ئەسپایی لە پێشمانەوە دەڕۆیشت و ئێمەش بێ ورتە پاژنەی پێمان لەلا ورگی ولاخەکانەوە دەژەند.

چەند جارێ سەیری ئەملاوئەولام کرد، هیچم نەدی لە پاسگا بچێ و کەسیشم بەدی نەکرد بەجلی سەربازییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بێدەنگ بووم، تا لە دێ ڕەت بووین، کاتێ لەوە دڵنیابووم کە ئێمە دەنگمان ناگاتە ناو دێ، بەولاخدارەکەم وت:

– هیچم بەدی نەکرد لە پاسگا بچێ و کەسیشم بەجلی سەربازییەوە بەرچاو نەکەوت، تۆ بڵێی پاسگاکەیان نەگواستبێتەوە؟

ولاخدارەکە ئاوڕی لێ دامەوە و برێ بەتوندی سەرنجی لێ دام و پاشان

تۆزێ بەتووڕە بوونەوە – وەك لە سەرنجەکەم قەڵس بوو بێ – وتی:

– کاکی برا، تۆ نەت دی!!

وڵاخدارەکە قسەی تری نەکرد و منیش زیاتر لەسەری نەڕۆیشتم. پاش نیوەڕۆ گەیشتینە دێی «وەردە»، وڵاخدارەکە شارەزاییەکی تەواوی لە ناوچەکەدا هەبوو، چونکە دەیزانی کام دێ و کام تەپولکە و سەری کام لووتکە، سوپا یان «دلاوەری» ئێرانیی پێوەیە، هەر بۆیەش بەشوێنی وادا دەیبردین کە لەوە دەچوو پێش ئێمە کەسی پیا تێنەپەڕی بێ!

هەر بەگەیشتنمان بۆ دێ یەکسەر لە وڵاخەکان دابەزین و لەسەر دەستووری پێشمەرگایەتی، خۆمان کرد بەماڵێکدا و خۆمان دامەزراند.

ئەوەی کە سەرنجی هاوەڵەکەمی بەتەواوی ڕادەکێشا، ئەم مەسەلەی دامەزراندنە بوو کە وەك دیاردەیەکی بێ وێنە دەهاتە پێش چاوی، چونکە پێشمەرگە لە لادێکانی کوردستاندا دەتوانێ، لە هەر ماڵی بیەوێ، دامەزرێ و پشوو بدات، نان بخوا و شەویش – ئەگەر کات ناوەخت بێ – لەلایان بەسەر ببا.

پاش نان خواردن کەوتینەوە ڕێ، ئەمجارەیان وڵاخدارەکە زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت، دەیویست پێش تاریك بوون، بمانگەیێنێتە سەردەشت، بۆیە ئێمەش هەر بێدەنگ لەسەر خێرایی ڕەوتی ئەو لە وڵاخەکانمانەوە دەژەنی. لە ڕێگا هیچ بابەتێکی قسەکردنمان نەکردەوە، جگە لەوەی کە هاوەڵەکەم جاروبار سەرسووڕمانی خۆی بەرامبەر قەشەنگی و جوانیی دیمەنی کوردستان دەردەبڕی و دەیوت:

– ئێستە دەزانم بۆ ئەوەندە کوردستانتان خۆش دەوێت...

لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بووین، هەر گرد بوو پیا هەڵدەگەڕاین و پاشان دا دەگەڕاینەوە، پاش هەموو گرد و گردۆڵکەیەك یەکێکی تر بوو، وردە وردە

تاریکی دا دەهات و لەوەش نەدەچوو بەو زووانە بگەینە شوێنی مەخسەد و لەو دەوروبەرەش هیچ جۆرە ڕۆشناییەك بەدی نە دەكرا كە هیوای ئاوەدانییەکی لە پشتەوە بێ، بۆیە بەوڵاخدارەکەم وت:

– لات وایە ئەمشەو بگەینە سەردەشت؟

وڵاخدارەکە سەریکی لەقاند و پاشان وتی:

– بڕوا ناکەم، زۆرخاو هاتین، بەڵام جارێ تاریکی بەتەواوی هەڵینەکوتاوەتە سەرمان، هێشتا تۆزێکی بەبەرەوە ماوە، بڕێکی تریش دەڕۆین و پاشان لە شوێنێك هەر لا دەدەین.

تەنیا دەنگی تریەی پەلی وڵاخەکان بوون کە دەهاتنە بەرگوێ و جاروباریش خشەی دار و دەوەنەکان بوون کە لە قاچ و قولی ئێمەوە دەخشان.

تاریکی، تا دەهات، زیاتر گەمارۆی دەورپشتی دەدا، پاش ماوەیەك ئەوەندە تاریك بوو کە چاوچاوی نەدەدی، هەر بۆیەش برادەرەکەم زۆر بەهێواشی پێی وتم:

– بەم تاریکییە تۆبڵێی کاکی وڵاخدار هەڵە نەکات؟

لە وەڵامدا وتم:

– ئەمانە شارەزان و بڕوا ناکەم ڕێ هەڵە بکەن...

وڵاخدارەکە زۆر بەناڕەزاییەوە قسەکانی پێ بڕین وتی:

– بەتاریکە شەو قسەکردن لەبار نییە!!

لە ڕاستیدا خۆشم ئەوەم دەزانی و ئەوەش یەکەمین جار نەبوو، کە ئامۆژگاری لەو بابەتە، ببیستم. لای وڵاخدار وایە، کە بەشەو، پیاو خراپ و دز و جەردە و ڕێگر زۆر دەبێ، بۆیە چاتر وایە پیاو بێدەنگ بێ، بۆ ئەوەی

ئاشكرا نەبێ، هەروەك لایان وایە كە قسەكردن بەتاریكی نیشانەی ترس و دڵەڕاوكێ و تۆقینە!. ئەمانە هەمووی، پاشان، بۆ هاوەڵەكەم گێرایەوە، بەڵام لەوێدا بەپێی باری سەرنجی ولاخدارەكە منیش قڕ و قەپم لێ كرد.

هەر لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بووین، كە ڕۆشناییەكمان لە دوورەوە بەدی كرد، لە ئاوایی دەچوو. لەگەڵ ئەوەشدا تا تەواو نزیك نەبووینەوە ولاخدارەكە هیچ قسەی نەكرد. كاتێ گەیشتینە بەردەم دێ وتی:

براینە ئەمشەو لەم دێیە لا دەدەین. ئێرە دێی «بێوران»ە. هەردووكمان ڕاستەوخۆ لە ولاخەكە دابەزین، تەواو كفت بوو بووین. سەرما دەمەو ئێوارە كاری خۆی بەتەواوی كردبوو، چونكە هەستم دەكرد كە تەواو گیانم ڕەق بووبێ. هاوەڵەكەشم هەر وابوو، چونكە ئەویش هەر كە دابەزین یەكسەر چەند جاری پشتی بەملاوئەولادا تەقاند و پاشان بەشێوەیەكی زۆر سەیر و پێكەنیناوی - كە ئەویش نیشانەی كفت بوون بوو - دەڕۆیشت.

ئەوشەوە هەرسێكمان لە دێ دامەزراین، خانەخۆی كەمان پیاوێكی زۆر ڕووخۆش بوو، لەوە دەچوو دەمێك بێ میوانی غەریبەی لەو بابەتەی ئێمە نەدی بێ، چونكە هەر پاش نان خواردن ڕاستەوخۆ كەوتە پرسیار كردن لێمان، كە خەڵكی كوێن و چ كارەین! كابرا هەر زوو زانیی كە ئێرانی نین، جارویاریش ڕووی دەمی دەكردە هاوەڵەكەم و قسەی بۆ دەكرد، ئەویش بەهۆی ئەوەی كە هیچ حاڵی نەدەبوو، هەر سەری بۆ دەلەقاند.

لەگەڵ ئەوەشدا، كە خاوەن ماڵەكە بەهەموو شێوەیەك دەیویست ئەوە نیشان بدا، كە جێی متمانەیە، بەڵام هەر نەمانوێرا بڵێین كە پێشمەرگەین، یەكەم لەبەر خۆمان و دووەمیش بۆ ئەوەی خانەخۆی دڵخورت نەكەین. ئەو شەوە خاوەن ماڵ زۆر شتی بۆ باس كردین، هەروەك دەربارەی زەمانی گەنجێتیی خۆی گەلێ سەر گوزەشتەی بەتامی بوگێڕاینەوە، هەرە

گرنگتریان ئەوە بووە کە زستانێك بەفر تا ناوقەد – وەك خۆی دەیوت – هاتووە، ئەم بەشاخەکەی پشتی دێدا، سنووری بڕیوە و سەری لە خزمەکانی، لە دیوی عێراق، داوە، هەرچەند ئەو مەسافەیەی ئەو باسی دەکرد لە چوار پێنج سەعاتێك تێ پەڕی نەدەکرد، کەچی ئەو مەسەلەکەی گەیاندبووە داستانێکی تێر و تەسەل و وا بەلەزەت دەیگێڕایەوە کە هاوەڵەکەم – سەرەڕای ئەوەی هیچیش تێ نەدەگەیشت– تەواو گیرۆدەی باسەکە بێ و بە تاسوقەوە تێی بڕوانێ و جاروباریش، سەیرێکی بەپەلەی من بکات، بەو نیازەی منیش جەمسەری مەسەلەکەی بۆ دەربخەم، شتێکی لێ حاڵی بکەم!

خاوەن ماڵ وای باس دەکرد گوایە ئەو مەسەلەی چوونەی بەزستان، بۆ ئەودیو، ئێستەش خەڵکی دەماودەم دەیگێڕنەوە و وەك نیشانەی ئازایەتییەکی بێ وێنە و بەجەرگییەکی لە ڕادە بەدەر، ئەهلی دێ، بۆ خەڵکی دەگێڕنەوە.

هاوەڵەکەم، دیار بوو، زۆر خەوی دەهات، چونکە، کە جارویار چاوی لێك دەنا، تا لەتری نەدەدا چاوی هەڵنەدەهێنایەوە. دەشێ قسەکانی، کە ئەو تێییان نەدەگەی، گێژی کردبێ، بۆیە منیش زۆر بەڕێزەوە بەخاوەن ماڵەکەم وت، کە ئێمە سبەی سەفەر دەکەین بۆ سەردەشت و ئەمڕۆش لە دوورەوە هاتووین، بۆیە حەز دەکەین ڕابکشێین.

کابرای خانە خوێمان، هەر دەستبەجێ، هاواری ژنەکەی کرد، ژنەکەش کەیبانوویەکی گورجوگۆڵ، لە چاو تروووکانێکدا، سێ جێی بۆ ڕاخستین. کاتێ چووینە سەر جێگاکانمان، هەریەکسەر ولاخدارەکەمان خەوی لێ کەوت، ئینجا من و هاوەڵەکەم بەئەسپایی کەوتینە دەمەتەقێ و کورتەی وتووێژی شەوەکەم – ئەوەی بۆ دەکرا بەعەرەبی – بۆ گێڕایەوە، هەر ئەوشەوە پێم وت کە لەمەودوا پرسیاری لێ کرا من خۆم وەڵام دەدەمەوە و

پاساوی بێدەنگی ئەویش بەوە دەدەمەوە کە کوردە و لە بەغدا گەورە بووە و کوردی باش نازانی. هێشتا من هەر قسەم بۆ دەکرد کە ڕوانیم ئەو پرخەی خەوی دێ، بۆیە منیش، لێفەکەم کێشا بەسەرماو لێی نووستم.

هەر شەوەکی، لە دەنگی کۆکە کۆکی ولاخدارەکە، بەئاگا هاتینەوە، کە سەیری سەعاتەکەم کرد بڕوام نەکرد، کات سێ و نیوی شەو بوو، بۆیە منیش بەدەم باوێشکەوە بەکابرام وت:

– بۆ وازوو هەستاویت، نیازی نوێژت هەیە؟.

لە وەلامدا ولاخدارەکە وتی:

– ئەی چۆن، بەلام ئێوەش خۆتان ئامادە بکەن، چونکە دەبێ زوو بکەوینە ڕێ. ئەمڕۆ نیازی گەڕانەوەم هەیە.

بەهەرحاڵ، ئێمەش، لە جێی خۆمان هەستاین و خۆمان پێچایەوە، کاتی لە ژوورەکە هاتینە دەرەوە و چووینە ناو حەوشی خانووەکەوە، دیمان ولاخدارەکەمان ولاخەکانی تەواو ئامادە کردووە و لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا، لەبەر قوتیلەیەك، بەو مەلا بانگدانە، کەوتونەتە جگەرە کێشان و دەمەتەقێ.

کاتێ سواری ولاخەکان بووین، خاوەن ماڵەکە، دەستەسڕێکی پڕ لە نان و تیشوی دایە دەستم وتی:–

حەزم دەکرد بەرچابی پێکەوە بخوێن، بەلام دیارە ئێوە پەلەتانە...

زۆر سوپاسی خاوەن ماڵەکەمان کرد و بەو تاریکییە کەوتینە ڕێ. سەرمای بەرەبەیان وەك چزو دەچزا بەدەموچاو و دەستوپەلماندا، ئاگام لێ بوو، هاوەڵەکەم، لە سەرماندا تەواو بەسەر ولاخەکەوە گرمۆڵە بووبوو، بۆیە پێم وت:

– جامانەکەت بکە بەلەچکت بۆ ئەوەی سەرمات نەبێ...

لە ڕاستیدا نازانم چۆن وشەی لەچکیشم کرد بەعەرەبی، بەهەرحاڵ،

بەشێوەیەك حاڵیم كرد كە لەچك چۆن دەكرێ و ئەویش دەقا و دەق بەپێی وەسفەكەم، جامانەكەی لەسەر و پۆتەڵاكیەوە ئاڵاند.

قافلەكەمان بەشینەیی ڕێگەی ڕووە و سەردەشتی تەی دەكرد. وڵاخەكان كاتێ پەلیان بەزەویدا دەكوتا، شەختەی بەفر و قوڕی بەستوو لە ژێر سمەكانیاندا ورد و خاش دەبوو، سەیرێكی ئاسمانم كرد، ئاسمان تەواو ساف و ڕوون بوو، ئەستێرەكانی دەمەوبەیان دەبریسكانەوە و یەكجار گەش دەهاتنە پێش چاو، تەنیا شتێكیش كە هێمنیی ئەو دەمە و بەیانییەی دەشڵەقاند خیزەی سنگی وڵاخدارەكەمان بوو، كە تێكەڵ بەپرمەی وڵاخەكان دەبوو، هەواش زۆر سارد بوو بەڕادەیەك لە هەموو هەڵمژینی هەناسەیەكدا وامدەزانی سییەكانم دەرزیاژن دەكرێن، هەر بۆیەش كلكی جامانەكەم لە دەم و لووتمەوە ئاڵاند.

هاوەڵەكەم لەسەر ئامۆژگارییەكەی دوێنێ شەو، كە بەتاریكی قسە نەكات، متەقی لە خۆی بڕی بوو. پاش دوو سەعاتێك، تاریكی دەورووپشتییان ڕەوییەوە، ئینجا دەورووپشتی خۆمان بەتەواوی بەدی كرد.

هەروا بێدەنگ بووین كە وڵاخدارەكە پەتی بێدەنگی پساند و بی ئەوەی ئاوڕمان لێ بداتەوە وتی:

– بەمەزنەم پێش نیوەڕۆ دەگەینە سەردەشت.

منیش ئەوەم بەهاوەڵەكەم وت و جارێكی تر بێدەنگ بووینەوە، پاش ماوەیەك خۆرهەڵات، دنیا كەمێ تەم بوو، تیشكی ڕۆژ كە ناو تەمەكەی دەبڕی، هەزاران هەزار هەستوونە زێڕینەی ڕەنگاوڕەنگی ئاڵووالای دەبریسكانەوە، دیمەنەكەی بەردەممان ئەوەندە سەرنجڕاكێش بوو كە هاوەڵەكەمی خستە گفتوگۆ و وتی:

– بەڕاستی ئەمە یەكەمین جارە دیمەنی وا دڵڕفێن و سەرسووڕهێنەر بەدی دەكەم!

پێش نیوەڕۆ گەیشتینە نزیك گەڕەکەکانی سەرووی سەردەشت، کاتێ تەواو نزیك بووینەوە ولاخدارەکە وتی:

- ئیتر پێویستە لە ولاخەکان دابەزن چونکە وا گەیشتینە سەردەشت، چاتر وایە بەپێ بچینە ناو شارەوە، بۆ ئەوەی سرنجڕانەکێشین.

ئێمەش بێ سێ و دوو لە ولاخەکان دابەزین و برێ خۆمان توند کردەوە و جامانەکانیشمان خستە بن هەنگڵمان. کابرای ولاخداریش ولاخەکانی دایە پێش خۆی و ئێمەش بەدوایدا، داگەڕاینە نێو سەردەشتەوە.

ناو «سەردەشت» ئەو پێش نیوەڕۆیە نائاسایی چۆڵ بوو، لە پێشدا نەمزانی هۆی چییە، بەلام پاشان کە گەیشتینە سەر جادەکان و سەربازەکانمان لەسەر شۆستەکانی شار دی، هۆی چۆڵ بوونەکەم، لێ حاڵی بوو.

ماوەیەك بوو، وەزعی ئێران تەواو شلۆقابوو، خۆنیشاندانی خەڵك لە سەرتاسەری ئێراندا، دژی ڕژێمی پەهلەوی، زۆربەی شارەکانی ئێرانی تەنیبووەوە، بەلام هێشتا بەو خەستییە لە ناوچە کوردییەکاندا بەدی نەدەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا کاری ناڕاستەوخۆی کردبووە سەرباری کوردستانی ئێران و کاتێ خەڵکەکە گوێیان لە خۆپیشاندانە مەزنەکانی تاران و شارە گەورەکانی تری ئێران دەگرت، ئەمانیش بەداخستنی دووکان و بازاڕ پشتگیریی خەڵکی کوردیان نیشان دەدا.

لەگەڵ ولاخدارەکەدا، کە بەجادەکاندا تێ دەپەڕین، کەس پرسیاری لێ نەکردین و ئێمەش بێ ئەوەی سەیری ئەملا و ئەولا بکەین، بەدوای ولاخەکانەوە، دەڕۆیشتین تا گەیشتینە بەردەم خانوویەك، لە کۆلانێکی باریکدا، ولاخدارەکە لە دەرگای ماڵەکەی دا، هەر دەرگا کرایەوە یەکسەر بەخاوەن ماڵەکەی وت:

- قوربان، هەندێ، میوانی ئەو دیوم بۆ هێناوی!

خاوەن ماڵەکە زۆر هەوڵی دا کە وڵاخدارەکەش لە گەڵماندا پشوویەك بدا، بەڵام ئەو وەك پێی وتبووین کە زۆر پەلەیەتی، بەگوێی نەکرد.

ئەو ڕۆژە لە سەردەشت ماینەوە، لەگەڵ خانە خوێکەماندا کەوتینە دەمەتەقێ و باسی دۆخی کوردستانی عێراق و شۆڕشم بۆ کرد، ئەویش کە خۆی بەدۆستمان دەزانی، گەلێ بەقسەکانم کەیفی دەهات، پاشان ئەویش باسی ئێران و شێواویی وەزعی شای بۆ کردین و باسی خۆپیشاندانێکی سووکەڵەی خەڵکی سەردەشتیشی بۆ کردین کە بەلای ئەوەوە کارێکی یەکجار مەزن بوو، هەروەك زۆر بەشانازییەوە باسی دەوری خۆی و خانوادەکەی بۆ کردین، کە چۆن کاریگەرانە بەشدارییان لەو خۆپیشاندانەدا، کردووە.

هەرچەند ئەو ژمارەیەی کە ئەو باسی دەکرد– وەك دەیوت زیاد لە سەد کەس – لە چاو بەشدارانی خۆپیشاندانەکانی تری ئێراندا شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بەڵام ئەگەر پیاو ئەو ڕاستییە لە بەرچاو بگرێ کە خەڵکی لە ژێر [وشاری] ڕژێمی داپلۆسینەری شاهەنشایدا، بەتایبەتی لە ناوچە کوردیەکاندا، کە نەیوێراوە هەڵوێستێکی نارەزایی هاوبەشی پێکەوەنیشان بدەن، ئەوەی سەردەشت، لە ڕاستیدا، بەکارێکی گەورە دەدرێتە قەڵەم.

ئەو شەوە لە سەردەشت ماینەوە و بەیانی زوو، خاوەن ماڵ، ئوتومبێلێکی بۆ حازر کردین و ئەوەشی پێ وتین کە سوپای ئێرانی زۆر سەیتەرەی لەسەر ڕێگاکان داناوە، بەڵام ئەوانە تەنیا بۆ چەك دەگەرێن و مەترسیی ئەوەیان هەیە کە چەك لە ڕێی کوردستانەوە بگاتە شارەکانی ئێران و خەڵکی لە خۆپیشاندانەکاندا کە دژی ڕژێم دەکرێ، بەکاری بهێنێ. لە ڕاستیدا واشبوو، چونکە خەڵکی ئێران زۆر بەتاسوقەوە، سەرەڕای گرانیی نرخی چەکیش – عەودالی بوون.

لە سەیتەرەکەی بەردەم سەردەشت ئوتومبێلەکەیان ڕاگرتین و

سەربازەکان برێك سەیریان کردین و بەڵام نە ئوتومبێلەکەیان پشکنی و نە هیچ پرسیارێکیشان لێ کردین. تەم سەرانسەری شاخەکانی ڕۆژئاوای سەردەشتی تەنیبووەوە و لە هەندێ شوێنیشدا داکەوتبووە سەر ڕێگاکە، چەند سەگێکی تووکن لە قەراخ ڕێگەکە وەنەوز بردبوونییەوە، لەوە دەچوو ئەو دیمەنە زۆر سەرنجی هاوەڵەکەمی ڕاکێشابی، چونکە ئانیشکێکی تێوە ژەندم و زۆر بەئەسپایی وتی.

– هەتا سەگەکانیش جیاوازن!

هەستم بەسەر بەرزیەکی بێ پایان دەکرد کە هاوەڵەکەم وابەو شێوەیە وەسفی وڵاتەکەمانی دەکرد، هەموو شتێك لە بەرچاوی ئەو جیاواز و دڵڕفێن و قەشەنگ و بێ وێنە بوو.

هاوەڵەکەم یەکەمجاری بوو کوردستان ببینێ، دیارە ئەوێ کە لە خوارووی عێراقەوە هاتبوو، بڕوای نەدەکرد کە جیاوازی بەو ئەندازەیە بێ، چونکە دەسەڵاتدارانی عێراق هەمیشە کوردستانییان بەناوچەی ژوورو ناو دەبرد، دەشێ ئەویش پێش ئەم گەشتەی وەیزانیبێ، هیچ جیاوازییەك تەنانەت لە سروشتیشدا، هەبێ! و مەسەلەی کوردستانیش کە دانیشتووانی شاناز پێوە دەکەن هەر بەشێ بێ لە بیرتەسکیی نەتەوایەتی، بەڵام من لەمەدا گومانم لە هاوەڵەکەم نەبوو چونکە دەمزانی ئەو هەڵگری چ بیروباوەڕێکی مرۆڤ دۆستانەیە.

ڕیزە جەمەلونێك، کە لە دوورەوە بەرامبەرمان شەوقیان دەدایەوە، سەرنجی ڕاکێشام، بۆیە پرسیارم لە شوفێرەکە کرد و ئەویش لە وەڵامدا گوتی:

ئەوانە ساڵی حەفتا و چوار، بۆ پەنابەرە عێراقییەکان، دروست کراون، ئێستەش بوونەتە سەربازگە.

کاتێ ئوتومبێلەکەمان گەیشتە بەردەم جەمەلۆنەکان، ڕاوەستا،

لەوحەیەك بەگەورەیی لێ نووسرابوو «ایست بازرسی پادگان ربط». چەند سەربازێك بەتفەنگی (ژێ سێ)وە، هاتنە بەردەممان بۆ ماوەیەك تێیان ڕوانین و پاشان چەند پرسیارێکیان لە شوفێرەکە کرد، ئەویش دەسبەجێ دابەزی و پشتی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ ئاواڵە کردن.

ئۆتۆمبێلەکەمان کەوتەوە ڕێ، شوفێرەکە وتی:

– دوێنێ یەکجار وا ئوتومبێلیان نە دەپشکنی. ئەمڕۆ زۆر بەوردی دەیانکرد، دیارە خۆپیشاندانەکەی دوێنێی مەهاباد تۆقاندوونی!

پاشان کەوتە باسکردنی خۆپیشاندانەکە، من زۆرم لا سەیر بوو، چونکە هیچ ڕادیۆیەك باسی ئەوەی نەکرد بوو، نە لە سەردەشتیش خانەخۆێکەمان ئاگای لەوەبوو، بەکورتی قسەکانی شوفێرم بۆ هاوەڵەکەم گێڕایەوە و باسی ئاڵۆزیی دۆخی نێو مەهابادم بۆ کرد و هیوای خۆشم دەربڕی کە بەگەیشتنی ئێمە وەزع هێمن بێ، چونکە کەسمان هیچ جۆرە شوناسنامەیەکی ڕەوامان پێ نەبوو.

دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە مەهاباد، هەر بەچوونمان بەنێو شار، هەستمان بەنائاسایی بوونی وەزعەکە کرد. سەربازەکانی ڕژێم، دەوروبەری جادەکانیان گرتبوو، چەند خودرەویك، لەسەر سووچی جادەکان، ڕاگیرابوون، خەڵکیش تاکوتەرا، بەسەر جادەکانەوە بەدی دەکران، بەڵام کەسمان هیچی وامان نەدی کە نیشانەی خۆپیشاندان بێ، ئەگەرچی جارویار گوێمان لە شریخەی چەند گوللەیەکیش دەبوو.

شوفێرەکە گەیاندینیە بەردەم ئەو ماڵەی ناونیشانمان بۆ هەڵدابوو، ئەوەی کە تەواو سەری سوورمانین، ئەوەبوو، بەدابەزینی ئێمە لە ئۆتۆمبێلەکە، خانەخوێکەی سەردەشتمان بەدی کرد کە لە تومبێلێکی پشتمانەوە دابەزی و یەکسەر لە بەردەمماندا قوت بووەوە و ڕاستەوخۆ خۆشحاڵیی خۆی نیشاندا کە بەسەلامەتی گەیشتوینەتە مەهاباد. من هەر

زۆر لام سەیر بوو، بۆیە کە چووینە ماڵەکەوە یەکسەر پرسیارم لێ کرد کە بۆچی ئەو ئەزیەتەی کێشاوە و بەدوامان‌دا هاتووە، لە وەڵامدا وتی:

– حەزم کرد کە تەواو دڵنیابم کە بەسەلامەتی دەگەنە مەهاباد، چونکە حەزناکەم لای برادەرانتان عەیبدار بم.

منیش زۆر سوپاسم کرد، بەڕاستی کارێکی پیاوانەی کرد بوو، کە لەبەر خاتری ئێمە، ئەو هەموو ڕێگایەی بڕی بوو.

زۆر نەبوو دانیشتبووین کە گوێمان لە دەنگی چەند ڕیزێك تەقە بوو، هاوەڵەکەی سەردەشتمان بڕی سەرنجی دایە سەعاتەکەی دەستی و پاشان داوای ڕوخسەتی لێ کردین و وتی:

– چاتر وایە بەزوویی بگەڕێمەوە بۆ «سەردەشت» نەکو ڕێویان بگیرێ...
کاتێ خواحافیزیمان لێ کرد، دەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵبێکی زۆر دەهاتە بەر گوێمان، هەر بۆیەش لە دەرگای ماڵەکەوە سەرم کێشایە دەرەوە، هیچی وام بەدی نەکرد، کەچی هاوار و قیژە هەر زیاد دەبوو، خاوەن ماڵەکەمان مەترسیی خۆی نیشان داین کە ترسی ئەوەی هەیە وەك دوێنێ خەڵکی لەگەڵ ژاندرمە و سوپادا تێك بئالێن.

ماوەیەك بوو، لە نێو دەرگاکەدا، ڕاوەستابووم کە لە ناکاوێکدا، لەسەری کۆڵانەکەوە، حەشاماتێك – کە زیاد لە هەزار کەس دەبوون – ڕژانە سەر جادەی بەر ماڵەکەمان و تێکڕا هووتافیان دژی ڕژێمی شاهنشاهی دەکێشا، ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام، چەند کەسێك بوون کە لە پێش خۆپیشاندەرەکانەوە دەڕۆیشتن و تەپڵیان لێ دەدا، هاوەڵەکەم کە ئەویش هاتبووە نزیکمەوە زۆر بەسەرسووڕمانییەوە دەیڕوانییە دیمەنەکەی بەردەممان، بەتایبەتی تەپڵ لێ دەرەکان کە لەگەڵ کوتانی تەپڵەکانیاندا، لائیلاهە ئیلا لاو ئەڵلاهو ئەکبەریان بوو. هاوەڵەکەم هەروا بەچاوی تاسۆقەوە دەیڕوانییە خەڵکەکە کە پێم وت:

– ئەمە خۆپیشاندانە دژی ڕژێمی شا، بەڕاستی ئێمەش لە کاتێکی ناسك و مێژوویيدا لێرەین...

هاواری، با بژی و بابڕووخێی گەنجەکان، تێکەڵ بەنزای خوای گەورەیەی پیرەکان دەبوو. کاتێ مەسیرەکە لە ماڵەکەی ئێمەوە ڕەت بوو، گەیشتە سەر سووچی جادەکە گوێمان لە دەنگی تەقینەوەیەکی گەورە بوو، هەر پاش ئەوە بوو بەدەستریژ و حەشاماتەکە، پەرشوبڵاوبووەوە و بەشێك خۆی دایە پەنا دیوار و بەشێکیش، کە لەوە دەچوو هەر لە سەرەتاوە، خۆیان بۆ شەڕە بەرد ئامادە کردبێ، کەوتنە بەرد هاویشتن.

زۆر مەراقم بوو، بزانم لەو سەر سووچی جادەکە، چی ڕوودەدا بۆیە ڕوخسەتم لە خاوەن ماڵ و هاوەڵەکەم وەرگرت و دەرپەڕیمە دەرێ و بەپەلە خۆم گەیاندە کۆتاییی جادەکە و لەوێوە سەیری لای خواروم کرد ، بیست سی ژاندرمە بەدیار چەند (خود ڕەویکەوە) ڕاوەستا بوون، هەریەکە و تفەنگێکی سەیری بەدەستەوە بوو، هەمووش کڵاوی تایبەتیان لە سەر نابوو، خۆنیشاندەرەکان خەریکی هاویشتنی بەرد و کەرسەك بوون، بەردەکان هەندێکی دەکەوت بەسەر ژاندرمەکاندا و هەندێکی بەر (خود ڕەوەکان) دەکەوت، ئیدی ژاندرمەکان کەوتنە تەقاندنەوەی گازی فرمێسك هێنەر و بەدوایشیدا دەستریژیان دەکرد.

هەر بەبڵاوبوونەوەی گازی فرمێسك هێنەر خەڵکەکە کەوتنە پژمین و کۆکە و منیش یەکسەر چاوم پڕبوو لە ئاو و هەناسەم سواربوو، بۆیە بەپەلە خۆم کشانە دواوە و گەڕامەوە بۆ ماڵەکە.

کاتێ خۆم بەماڵەکەدا کرد حاڵم پەرێشان بوو، خاوەن ماڵ و هاوەڵەکەم زۆر ترسان و وایان دەزانی بریندار بووم، بەڵام من زوو تێم گەیاندن کە هیچم بەرنەکەوتووە و تەنیا تۆزێ گازی فرمێسك هێنەرم هەڵمژیوە.

ژنی خاوەن ماڵەکە جامی ئاوی فریاخستم و پاشان وتی:

– واچاترە، براینە بچنە ژوورەکەی دیوی پشتەوەمان، ئەمە دنیایە نەك ژاندارم بێن بۆ پشکنین...

پێشنیارێکی بەجێ بوو، ئێمەش یەکسەر بەگوێمان کرد و چووینە ژوورێکی بچکۆلانەوە کە دەتوت هەر بۆ خۆشاردنەوە تەرخان کراوە.

زۆر مەراقی دەنگوباسی دەرەوەم بووم، بەڵام لەبەرئەوەی نە خاوەن ماڵ و نە کوڕەکەی گەڕابوونەوە، لە هەموو شتێ بێ خەبەر بووم.

دەمەو عەسر کوڕی خاوەن ماڵەکەمان گەڕایەوە، بەشڵەژاویدا لەوە دەچوو، بەشداریی کارێکی گرنگی کردبێ، ویستم پرسیاری وەزعی دەرەوەی لێ بکەم کە خۆی یەکسەر دەستی بەقسەکردن کرد و وتی:

– کوڕێك لە بەردەم [قایم قامیەت]دا بەدەمانچەیەك یەکێك لە کارمەندانی چڵکاو خۆری دەوڵەتی تلیسانەوە...

کوڕەکە بڕێك سەرنجی داین، لەوە دەچوو بیەوێ کاردانەوەی ئەو ڕووداوە لە سەر و چاوماندا بخوێنێتەوە، پاشان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی:

– بەڵام بەداخەوە ژاندرمەکان فریاکەوتن و لە هەموو لایەکەوە ئابلۆقەیان داو شەهیدیان کرد.

کوڕی خاوەن ماڵەکە، هەندێ شتی تری بۆ باس کردین و دەربارەی خۆنیشاندانەکەش پێ وتین، کە هەر ئەوە نەبووە کە ئێمە دیومانە، بەڵکو لە زۆر شوێنی تری مەهابادا خەڵکی بەرەنگاری ژاندارم و ئەرتەش و پیاوانی سەربە ڕژێم بوونەتەوە.

ئەو عەسرە بەدیار ڕادیوە هەر خەریکی هەواڵ وەرگرتن بووین، ڕادیۆکانی جیهانیش، زۆربەیان، باسی خۆنیشاندانەکانی شارەکانی

ئێران، بەتایبەتی تاران و تەوریزیان دەکرد، هەواڵەکان دەیانوت، شا لە ژێر گوشاری ڕاپەڕینی خەڵکدا، گەلێ لە زیندانییە سیاسیەکانی بەرداوە، لەوانەش هەندێ سیاسی کوردیش، کە لەمەو دوا زانیمان هەندێکیان خەڵکی مەهاباد بوون.

سێ شەو لە مەهاباد خۆمان شاردەوە، لە کاتێکدا خۆنیشاندانەکەش هەر ئەو ڕۆژە خاوبووە، بەڵام باری گشتیی ناو شار و تێکڕا وەزعی سیاسیی ئێران گەلێ ناسك و لە جۆشدا بوو، هەمیشە چاوەڕێی ئەوە دەکرا کە لە ئان و ساتدا ڕاپەڕینێکی تر بتەقێتەوە و خەڵکی بڕژێتەوە سەرجادە و شەقامەکان.

ژنی خاوەن ماڵەکە(١)، ئەو چەند ڕۆژە خزمەتێکی تەواو نایابی کردین، بەڕادەیەك کە هەرگیز بیرمان نەچێتەوە، هەرچەندە کەرەمی خەڵکی مەهاباد لە ناو ئێمەدا مەشهوورە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی ئەو ماڵە لەگەڵ ئێمە کردیان - کە تەنیا ئەوەندەیان دەزانی کە دوو پێشمەرگەی کوردستانی عێراقین - گەلێ زۆر بوو، بەتایبەتی بۆ هەردووکمان کە لەو شاخ و کێوەوە هاتبووین.

خاوەن ماڵەکەمان ئۆتۆمبێلێکی بۆ پەیدا کردین بۆ «شنۆ» و خۆشی تا ئەوێ لەگەڵماندا هات و بردینیە ماڵە دۆستێکی خۆی.

شنۆش هەروەك مەهاباد ئاڵۆز بوو، هەرچەند لەوێ هێشتا خۆنیشاندان ڕووی نەدابوو، بەڵام مانگرتنی خەڵکی شارەکە بەنەکردنەوەی دووکان و بازار، هەر بەشێك بوو لە پشتگیریی خۆپیشاندانەکانی سەرانسەری ئێران.

شەو لە «شنۆ» ماینەوە، دۆستان و برادەرانی خانەخۆێکەمان سەریان داین، و زۆر بەتاسوقەوە لە هەواڵ شۆڕشی کوردستانی عێراق یان دەپرسی، میوانەکان خوێندەوار و ڕۆشنبیری شنۆ بوون، ئەوان مەترسیی

(١) ژنی گۆرانی بێژی بەناوبانگ محەمەدی مامڵێ بوو.

خۆیان لەوە نیشان دەدا کە ئەگەر بێتو لە ناوچەی کوردستانی ئێران خۆپیشاندان پەرەبسێنێ، ڕژێمی شا، هەر بۆ چاو ترسێنی خەڵکی تری ئێران، زۆر بەتوندوتیژی وەڵامی خەڵکی کوردستان بداتەوە، لای ئەوان وابوو کە کوردەکانی ئێران دەبێ سەبر بگرن، تا ڕاپەڕینی خەڵك، لە ئێراندا هەموو شوێنێك دەگرێتەوە، ئەوجا گەلی کورد دەست پێ بکات!.

بەڵام من پێم وتن، کە بەپێچەوانەوە، پێویستە خەڵکی کوردستانی ئێران، شانبەشانی گەلانی ئێران، دەست بەڕاپەڕین بکەن و گەلی کورد لە جموجۆڵ و خەباتی شۆڕشگێڕی لە گەلانی تری ئێران دوا نەکەوێ و پێویستە گەلی کورد، زۆر بەجۆشەوە، بەشداریی ڕاپەڕین و خۆپیشاندان و مانگرتنی خەڵکی بکا، بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی شاهەنشاهی کە بووبووە مایەی ئەوپەڕی دواکەوتن و سەرکوتکردن لە کوردستاندا.

ڕژێمی شاهەنشاهی کە لە ماوەی نیو سەدەدا، جگە لە ترس و دواکەوتن و بەرەڵڵایی وماڵوێرانی هیچی تری پێشکەش گەلی کورد نەکرد بوو، ئەوە سەرەڕای هەزاران ساواك و دلاوەر – جاش – و پیاو خراپ و کارمەندی دەوڵەتیی پیس، کە تێکڕا، پێکەوە دەستیان نابووە بینی گەلی کورد، بەهیوای تاساندنی هەستی نەتەوایەتی و خاپوورکردنی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕی و داپلۆسینی جەماوەریان کردبووە دروشمی سەرەکیی خۆیان.

دیارە کویلیەتی چەندین ساڵە و مێردەزمەی ناقوڵای شاهەنشاهی وا بەئاسانی لەسەر سنگی خەڵکی نە دەڕەوییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا میوانەکان سەری ڕەزامەندییان بۆ قسەکانم لەقاند، جا نازانم لە شەرما بوو کە نەیان دەویست بەرپەرچی پێشمەرگەیەك بدەنەوە یا بەڕاستی قەناعەتیان بەباری سەرنجەکەم هێنا، ئەوە نازانم.

ئەو شەوە لە «شنۆ» ماینەوە و بەیانی زوو هاتینە دەری، ساحێب ماڵەکە پێشنیارێکی بۆ کردین، کەوا چاترە بەئۆتۆمبێل نەڕۆین بۆ دێی «زیوێ»

کە مەبەستمان بوو، چونکە دەکەوێتە سەر سنووری تورکیا و دەشێ ئێمەش لەو ناوە، سەرنجی خەڵکی ڕابکێشین، ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە سەیتەرەش لە بەردەم دێدا هەبوو، بۆیە ئەولای وا باشتر بوو کە تا دەرەوەی «شنۆ» بەئۆتۆمبێل بڕۆین و پاشماوەی ڕێگاکەش بەتراکتۆر، چونکە: یەکەم، تراکتۆر کەم سەرنجڕادەکێشێ و دووەمیش، دەتوانێ بەلا ڕێدا بڕوات.

بەڕاستی ئێمەش کە نەمان دەویست تووشی بەلای لابەلابین، بێ چەند و چۆن پێشنیارەکەیمان قبووڵ کرد.

ئەو بەیانییە «شنۆ» زۆر سارد بوو، هەورێکی یەکانگیر بەری ئاسمانی گرتبوو، ساردیی هەوا و ئەو هەورە قورسە هەمووی نیشانەی ئەوە بوون کە بەزووترین کات ڕەنگە و دەشێ شتێ بباریّ، بۆیە بەساحێب ماڵەکەمانم وت:

تۆ بڵێی دانەکاتە باران؟

زیاتر مەبەستم ئەوە بوو کە بڵێم، ئەگەر داکاتە باران چۆن بەتراکتۆر ڕێ دەکرێ، ئەویش وەك تەواو لە مەبەستەکەم گەیشتبێ بەزەردەخەنەیەکەوە وتی:

کاکی برا، لێرە، لەم وەرزەدا، داناکاتە باران، ئەگەر باری ئەوا تەنیا بەفرە، ئێرە ناوچەی «شنۆ»یە!.

سواری ئۆتۆمبێلێك بووین و وردە وردە لە شار دەرچووین، لە دەرەوەی «شنۆ»، نزیك دێیەك، ساحێب ماڵەکەمان ئوتومبێلەکەی ڕاگرت و ئێمەش دابەزین، کاتێ ئوتومبێلەکە بەجێی هێشتین پێی وتین:—

— ئێوە لێرە چاوەڕێم بن، بزانم لە ناو دێ تراکتۆرێ پەیدا ناکەم.

بۆ ماوەی سەعاتێك لە قەراخ جادەکە خۆمان مەشغوول کرد و کەوتینە

باسکردنی سەفەرەکەمان، هاوەڵەکەم کە زۆر بەسەرسوورمانەوە دەیڕوانییە شاخ و کێوە سەرکەشە سپییەکانی دەوروپشتمان، وتی:

– باشە لە کوێوە دەچین بۆ تورکیا؟

منیش لە وەڵامدا وتم:

ئێستا نازانم، بەڵام وابزانم هەر دەبێ لە یەکێ لەم شاخانەی دەوروپشتمانەوە سنوور ببڕین.

ئێمە ئاڵۆزی دەمەتەقێ بووین کە گوێمان لە دەنگی تراکتۆرێك بوو، کە تراکتۆرەکە نزیك کەوتەوە لێمان، هاوەڵەکەی شنۆمان خۆی فڕێ دایە خوارێ و ڕاستەوخۆ بەشوفێرەکەی وت:–

– ئەمانەن برادەرەکانم! دەیانەوێ سەر لە خزمێکیان بدەن لە (زیۆی). جا وەك پێم وتیت، دەکرێ بەلاڕێدا بیانگەێنیت!

خوا حافیزیمان لە هاوەڵەکەی «شنۆ»مان کرد و گەلێ سوپاسیشیمان کرد، بەڕاستی کارێکی زۆری لە پێناودا کردین بەتایبەتی بەو ڕۆژە ساردە.

هەردووکمان سواری تراکتۆرەکە بووین، هەریەکە و لەسەر چامەلغێکی، پڕۆشەی بەفر دەیدا بەسەروچاوماندا، هاوەڵەکەم جامانەکەی زۆر لێ زانانە لە سەروچاوییەوە ئاڵاند بوو کە بەتەنیا چاوەکانی بەدی دەکران، دەستیشی وا بەتوندی گرتبوو بەچامەلغەکەوە لە تاسەکانیشدا لەشی نە دەجوولا.

شوفێرەکە لەوە دەچوو زوو چاك لە ڕاسپاردەی برادەرەکەی شنۆمان گەیشتبێ، چونکە هێشتا زۆری مابوو بگەینە پاسگاکەی نزیك دێ، کە لە دوورەوە لەسەر تەپۆڵەکەیەك بەدی دەکرا، ئەو بەلا ڕێدا لای دایە ناو دێی (زیوێ)، کاتێ گەیشتینە ناو دێ، بەفر بەتەواوی دای دەکرد، کەسی واشمان بەدەرەوە نەدی کە پرسیارێکی لێ بکەین، بەڵام چاك بوو

شوفێرەکەمان زۆر شارەزا بوو، چونکە هەرکە ناوی ئەو ماڵەمان بۆ هێنا کە نیازمان بوو بۆی بچین، ئەو یەکسەر بردینیە بەردەمی. شوفێرەکە تەواو حاڵی بووبوو لێمان و دەیزانی نیازمان چییە، بۆیە لە خواحافیزیدا داوای سەرکەوتنی بۆ کردین و وتی:

– لە ڕۆژی بەفر و تۆفدا، سنوور نەبرن!

«زێوی»، ئاخر مەڵبەندی ئێرانمان بوو، لەوێوە بەتەما بووین بچینە دیوی تورکیا، هەروەك ڕاسپاردەشمان پێ بوو بۆ دەلیلەکەمان کە بڕیار وابوو بەگەیشتنی ئێمە، ئەویش لە دێ چاوەڕوانمان بکا.

لەو ماڵەی لێی بووین، پاش پشوودان، هەواڵی دەلیلەکەمان پرسی، ئەویش دەیناسی، پێی وتین:

– دوو ڕۆژە چاوەڕوانە!

بەو هەواڵە گەلێ دڵخۆش بووین و یەکسەر بەهاوەڵەکەم وت کە گەشتەکەمان ڕوو لە سەرکەوتنە و لەوە دەچێ هیچ دوانەکەوین.

ئێوارێ خاوەن ماڵەکەمان ناردی بەشوێن دەلیلەکەماندا کە لە ماڵێکی تربوو بەبینینی کاك «م» کە دەلیلی ڕێگەمان بوو، زۆر خۆشحاڵ بووین و ئەو شەوە پێکەوە دانیشتین و باسی چۆنیەتی پەڕینەوەی سنوورمان کرد. کاك «م» گەلێ شارەزابوو، لە لایەك خۆی خەڵکی دیوی کوردستانی تورکیا بوو، لە لایەکی تریشەوە – وەك خۆی دەیوت – هەزاران جار خەڵکی پەڕاندووەتەوە و ڕێنمایی کردوون.

ئەو شەوە هەموو پێکەوە نووستین، بەیانی کە هەستاین هەرگیز بڕوامان نەدەکرد، بەفر تێکڕا دنیای داپۆشیبێ، وابوو، بەڕادەیەك کە بەئاستەم ماڵەکان بەدی دەکران، بۆیە «م» پێی وتین:

– بەڕاستی بێ شانسییە، ئەم هەموو بەفرە چییە، ئەمشەو باریوە!؟

پاش بەرچایی، هەموو پێکەوە، دانیشتبووین و خۆمان ئامادە دەکرد کە «م» وتی:

لام وایە ئەمرۆ چاوەڕێ بکەین چاتر بێ، با بزانین لەو دیوەوە کەس دێ و بەفرەکە دەشکێنێ، چونکە بەفری وا زۆر لێرە بباریێ، ئەوە ئیتر دەربەندەکە هەر مەپرسە!

هیچ قسەم نەکرد، لە ڕاستیدا خۆشم شارەزای سێگۆشەی سنوور بووم، چەند جارێکیش لە سالّی حەفتا و حەوتدا، ئەمدیو و ئەودیوم پیا کردبوو بۆیە منیش سەری ڕەزامەندیم بۆ لەقاند و وتم:

– دەزانم. ئێمەش چاوەڕێ دەکەین تا بەفرەکە دەشکێنرێ...

ئەو ڕۆژە ماینەوە، سێ قوولی باسی بەسەر هاتەکانی خۆمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە.

ڕۆژی داهاتوو بەفر خۆشی کردەوە و ئاسمان ساف و هەتاوێکی خۆش بوو، کە لەگەلّ ئەو وەرزەدا نە دەگونجا، بۆیە زۆر بەکەیفەوە بە «م»م وت:

– تۆ بلّێی ئەمرۆ بتوانین بڕۆین؟

– لە وەلاّمدا «م» وتی:

– دەتوانین، بەلاّم چاتر وایە ئەمڕۆش سەبر بگرین و بزانین کەس لەو دیوەوە ڕێ ناشکێنێ، بەڕاستی دەربەندەکە زۆر بەفر دەیگریتەوە.

بێگومان ئەو شارەزاتر بوو، بۆیە ئێمەش بێ موناقەشە ڕاکەیمان پەسند کرد...

خەلّکی دێ، ئەو پێش نیوەڕۆیە، هەموو خەریکی بەفرمالّین بوون، دیار بوو دەیانویست سوود لەو ڕۆژە خۆشە وەرگرن و سەربان و حەوشەکانیان بمالّن. دوای نیوەڕۆ، «م» بۆ ماوەیەك بەجێی هێشتین و کە هاتەوە یەکسەر وتی:

– دەمەو ئێواریێ پێش تاریك داهاتن، دەڕۆین بۆ جێگەیەکی تر، دێیەکی بچکۆلانەیە نزیك ئەو دەربەندەی پێیدا تیێ دەپەڕین. لەویێ بێین چاکترە و نزیکتر و سەلامەتترە.

دەلیلەکەمان ڕووی نە دەهات مەترسیی خۆی نیشان بدات و پێمان بڵیێ گوایە خەڵکی دیێ، چەند لۆرییەك سەربازیان دیوە کە بەیانی زوو هاتوون و لە نزیك پاسگاکەوە ڕاوەستاون. بەڵام ئێمە ئەوەمان دەزانی، چونکە خاوەن ماڵەکە لە چوونە دەرەوەی «م»دا ئەو زانیاریانەی پیێ ڕاگەیاندین و ئەوەشی بۆ ڕوون کردینەوە کە هاتنی لۆریی سەربازی بۆ پاسگا، تەنیا بەمەبەستی دوو شتە، یا ئیخباری قاچاغە کە لە تورکیاوە دیێ، یا بۆ خەڵکی قاچاغە کە دەیەویێ سنوور ببڕیێ.

بەهەرحاڵ ئێمە هیچ ئەمسەر و ئەوسەرمان لەگەڵ دەلیلەکەمان نەکرد و ئامادەییی خۆمان نیشان دا، بۆ هەرکوێیەك بمانبات.

دەمەو ئێواریێ کە وردە وردە دنیا تاریك دەبوو، لە دیێ هاتینە دەریێ و بەرەو ماڵەکانی نزیك دەربەندەکە، دوای «م» کەوتین.

چرای ماڵەکان لە دوورەوە کز کز دەسووتان، سەگوەڕ بەپێی نزیکبوونەوەمان تا دەهات حەپەیان بڵندتر دەبوو، کاتیێ گەیشتنیە بەرماڵەکان. سەگەکان بەهیچ شێوەیەك مۆڵەتیان نەدەداین بڕۆینە ئەو ماڵەی «م» دەستنیشانی کردبوو، بۆ ماوەیەك هەروا دەستەوەستان ڕاوەستاین تا «م» بەهەموو دەنگی هاواری لە ساحێب ماڵەکە کرد، ئەویش وەك تەنیا چاوەڕێی ئەو بانگکردنە بیێ، دەستبەجیێ بەقوتیلەیەکەوە لە خانووکەی دەرپەڕی و بەچغە چغ سەگەکانی لیێ دوور خستینەوە.

کاتیێ چووینە ژوورەوە، خاوەن ماڵ گەلیێ عوزر خواهی بۆ هێنایەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەرهەق حەپ و بەهۆڕی سەگەکانی، وەك پاساوێك وتی:

– لەم نێوچە دوور دەستانە، لەبەر دز و پیاوخراپ، ماڵ بیێ سەگ ئیدارە ناکات...

منیش لە وەڵامدا، بۆ سەلماندنی قسەکانی وتم:

– بێگومان.

پاش شیوی ئێواریێ، لەگەڵ خاوەن ماڵەکە کەوتینە دەمەتەقە، خۆشترین باسیش لای ئێمە– لەو کاتەدا– مەسەلەی پەڕینەوە لە سنوور بوو، بۆیە منیش گەلێ پرسیارم دەربارەی ڕێگەوبانی سێ سنوور لێ کرد و پاشان پێم وت:

– دوێنێ و ئەمڕۆ، کەس لە تورکیاوە نەهاتووەتە ئەمدیو؟

کابرا ماوەیەك خۆی خەریکی دەرگای سوپاکە کردووە بەمقاش کەوتە تێکدانی پشکوکان و خۆڵەمێش دەرهێنان، پاشان لەسەرخۆ پشکۆیەکی بەمقاشەکە دەرهێنا و زۆر وەستایانە سیغارێکی پێ داگیرساند و دوایی، ڕووی دەمی تێ کردم و بەشینەیی لێشاوێ چڕە دووکەڵی بەسەروچاومدا کرد، ئینجا وتی:

– نەء!! بڕواش ناکەم کەس، سبەی و دووسبەی بتوانێ خۆی لە قەرەی ئەو بەفرە بدات. ئەمساڵ هەر لە سەرەتاوە دیار بوو کە ساڵەکەی یەکجار تووشە!

بەپێی قسەی کابرا، لەوە دەچوو، چەند ڕۆژێ لەو ناوە بمێنینەوە بۆیە منیش شانم لێ دادا و بەڕادیۆی ترانسیستۆری ماڵەکەوە خۆم خەریك کرد و جارویاریش دیشلەمەیەکی ڕوونم – لەسەر دەستووری خۆیان – دەمکرد بەگەرووما. دەلیل و خانەخوێکەش، بەجووتە سەرگەرمی جگەرەکێشان و چا خواردنەوە و گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆیان بوون. هاوەڵەکەشم کە هەر زوو کتێبۆلکەیەکی شیعری کوردی کۆنی، لە تاقێکی ماڵەکەدا دۆزیبۆوەوە، زۆر بەتاسوقەوە خەریکی پەڕەهەڵدانەوەی بوو، دیار بوو ئەویش دەیویست سوود لەو فرسەتە وەربگرێ و بەهۆیەوە خۆی تۆزێ فێری زمانی کوردی بکات، چونکە جارویار مانای چەند وشەیەکی لێ دەپرسیم.

سەگوەڕێ لە ناکاودا دەستی پێ کرد، ئەمجارەیان گەلێ لە پێشوازییەکەی ئێمە بەهێزتربوو، بۆیە هەموو سەیری یەکتریمان کرد و هەمووش بۆ ساتێ بێ ورتە، گوێ قولاخ بووین. حەپ و هۆڕی سەگەکان تا دەهات بەتینتر دەبوو، بۆیە دەلیلەکە و خاوەنماڵەکە پێکەوە ڕاپەڕین و بەشوێن سۆراخی سەگوەرەکەدا وێل بوون. ئەوەندە نەبوو لە دەرەوە بوون کە بەپرتاو خۆیان کردەوە بەژووردا، هەردووکیان ڕەنگیان تەواو پەری بوو، بەهەناسە برکێ و دەمێکی تێکەڵوپێکەڵەوە وتیان.

– ژا... ژاندرمە هات!

ئێمەش بەپەلە پروزێ، بێ ئەوەی هیچ پرسیارێ بکەین، پەلاماری پێڵاوەکانمان داو یەکسەر بەڕاکردن، بەناو بەفرەکەدا، دوای دەلیلەکەمان کەوتین. هەرچۆنی بوو زۆر بەخێرایی خۆمان گەیاندە دەرەوەی حەوشەی ماڵەکە و لە پەنا خەرمانە زەلێکدا خۆمان مەلاس دا. هەموو ورتەمان لە خۆمان بڕیبوو، بەلام ئەوەندە بەتوندی هەناسەمان دەدا، کە ئەگەر بهاتایەو یەکێ لەو نزیکانەوە تێ پەڕیبایە، بەئاسانی هەستی بەبوونمان دەکرد و دەیدۆزینەوە.

ماوەیەك هەروا خۆمان لە پەنا خەرمانە زەلەکەدا مەلاس دا کە من وردە وردە سەرێکم بەرزکردەوە، چەند لۆرییەك بەقەراخ ماڵەکاندا تێ پەڕین و ڕووە شاخەکە ڕۆیشتن، بۆیە بەئەسپایی بە«م» وت:

– ئەمە یانی چی؟

دەلیلەکەمان، کە وەك ئێمە، ئەویش لە ژاندرمە دەترسا، زۆر بەسادەیی وتی:

– نازانم!

ماوەیەك بەبێ دەنگی لە ناو بەفرەکەدا ماینەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە

ماوەی ڕاکردنەکەمان ئەوەندە زۆر نەبوو، کەچی من هەموو گیانم نیشتبووە سەر ئاو، بۆیەش پاش وشك بوونەوەی لەشم تەواو هەستم بەسەرما دەکرد، دیار بوو هاوەڵەکانیشم وەك خۆم وابوون، چونکە پیاو بەئاسانی گوێی لە چوقە چوقی دانیان دەبوو، دیارە ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە کەسمان فریای ئەوە نەکەوتین کە قەمسەلە لەبەر بکەین.

پاش نیو سەعات چاوەڕوانی، لۆرییەکان بێ ئەوەی توخنی ماڵەکان بکەون، سەرەو خوار گەڕانەوە و هەر زووش لە چاو ون بوون.

ئێمە هەر لە شوێنی خۆمان بووین کە خاوەن ماڵەکە، بەهەڵە داوان گەییە لامان و زۆر بەخۆشحاڵییەوە وتی:

– شوکر لە سایی خواوە نەهاتن بۆ لای ئێمە. فەرموون بۆ ماڵەوە!

بەشێنەیی لە جێی خۆمان هەستاین و دوای خاوەن ماڵەکە کەوتین. لە ڕێگا خاوەن ماڵەکە وتی:

– دیارە ئیخبارییەکراوە کە ماڵی قاچاغ دێت!!

من زۆر سەرم سووڕما لەو قسانە، چونکە وەك ئێمە دەمانزانی کەس لەو دیوەوە نەهاتبوو، ئیتر چۆن دەزانرا قاچاغ دێ!؟ کە گەیشتینەوە ماڵەوە، خاوەن ماڵەکە هەر خێرا، زۆپاکەی گڕدایەوە و بڕێ کۆتەرەی تری فڕێدایە ناوییەوە و ئێمەش هەرسێکمان خۆمان بەدەوری زۆپاکەدا گرمۆڵە کرد. خاوەن ماڵ بەدەم تێکردنی چاوە پێی وتین:

– زۆرجار کە ئیخبارییە بێت، ژاندرمەکان وەك ئەمشەو، تا دەم دەربەندەکە دەچن و لەوێ بۆسە بۆ قاچاغچی دادەنێن.

جارێکی تر لەگەڵ دەلیلەکەماندا کەوتینە گفتوگۆ دەربارەی ڕۆیشتنەکەمان، دەلیلەکەمان هەر لای وابوو کە دەبێ ماوەیەکی تر چاوەڕێ بکەین، بەلایەنی کەمەوە تا زەلامێك لە دیوی تورکیاوە دێ. خاوەن

ماڵەکە تەواو گوێی خۆی قۆلاخ کردبوو بۆ قسەکانمان، ئەویش لەسەر مەسەلەی ڕۆیشتنەکەمان وتی:

– ماشاڵڵا ئێوە هەرسێکتان گەنجن! بەڕای من هەر بەیانی زوو، ناوی خوای لێ بهێنن و بڕۆن چاترە! نەکو خوانەخواستە ژاندرمەکان بزانن پێتان و تووشی چەرمەسەری و بگرە و بەردە ببن!

لام سەیر بوو کە خاوەن ماڵ وا دەڵێ، چونکە هەر خۆی دەمە و ئێوارێ دەیوت گوایە ڕۆیشتن لەو بەفر و تۆفەدا، تەنیا خۆ بەکوشتدانە! کەچی هەر خۆشی دەڵێ بەیانی ناوی خوای لێ بهێنن چاکە، گوایە ئێمە گەنجین!.

لەگەڵ ئەوەشدا من لە مەبەستی کابرا گەیشتم، ئەویش ناهەقی نەبوو، دەترسا و حەزی دەکرد بەزووترین کات، بێ تەنگوچەڵەمە، بەڕێمان بکات، بۆیە منیش ڕووم کردە هەموویان و وتم:

– باشە ئەگەر بەیانی، بەفر نەبارێ و دونیا خۆش بوو، ئەوا دەڕۆین!

ئەو قسانەشم بۆ هاوەڵەکەم ڕوون کردەوە. یەکەمجار بڕوای نەکرد، بەڵام کاتێ بۆم باس کرد کە بەفر بەو ڕادەیە ترسناك نییە و خۆشم چەندجاری هەر لە زستاندا ئەو سنوورەم بڕیوە – هەرچەند لەو دەربەندە نەبووە – بەڵام هەر زستان بووە، ئەویش بەناچاری سەری ڕەزامەندیی بۆ لەقاندم و بڕیارمان دا کە بەیانی، بەمەرجێ بەفر نەبێ، ناوی خوای لێ بێنین.

«م» تەواو چووبووە خەیاڵەوە، لەوە دەچوو دوو دڵ بێ یا بیر لە شتێك بکاتەوە، بۆیە منیش وەك سۆراخێك بەدوای ئەندێشەی وێڵیدا وتم:

– زۆر ئاڵۆز دیاری، بیر لە چی دەکەیتەوە؟

ئەویش وەك تەنیا چاوەڕێی پرسیارێکی لەو بابەتە بێ، یەکسەر وتی:

– هەڤاڵ، بەسێ کەسەوە زۆر زەحمەتە بتوانین ئەو دەربەندە ببڕین،

چونكە تەنیا دەربەندەكە نییە، بەڵكو سەركەوتنە بەسەر شاخەكەشدا، كە لەم وەرزەدا زۆر سەختە...

منیش بێ سێ و دوو وتم:

- ئەی چار؟

«م» كەوتە بیركردنەوە، هەموومان بەتاسوق و بێ سەبرانە تێمان دەڕوانی، ئەویش پاش ساتێ لەسەرخۆ وتی!

ئەمشەو دەچم بۆ «زیوێ» و لەوێ چوار پێنج كەس بەكرێ دەگرم كە لەگەڵماندا بێن و بۆ ڕێ شكاندن، هەروەك تفەنگەكەشم لەوێ شاردووەتەوە لەگەڵ خۆم دەیهێنمەوە...

-چۆنە لاتان؟

زۆر بەو پیشنیارە خۆشحاڵ بووین، تەنانەت خاوەن ماڵەكەش سەری ڕەزامەندیی لەقاند. «م» بەپەلە خۆی كۆكردەوە و لە خواحافیزیدا وتی:

- بەیانی ئەگەر دنیا خۆش بوو، ئەوا خۆم و ئەو زەلامانە دێین بەدواتانا. ئیتر لەسەر خوا...

هەر لە دوای ڕۆیشتنی «م» ئێمەش بۆی ڕاكشاین. هەموو هیوایەكم ئەو شەوە ئەوەبوو كە بەیانی هەڵدەسین دنیا خۆش بێت.

ئەو شەوە چەند جارێك خەبەرم بووەوە و هەموو جارێكیش لە پەنجەرە بچكۆلانەی ژوورەكەوە دەمڕوانییە ئاسمان.

بەیانی سەعات (٥) لە كۆكەكۆكی خاوەن ماڵەكە و تەقوهۆڕی كەیبانووكەی خەبەرمان بووەوە. خاوەن ماڵ بەباوەشێك كۆتەرە دارەوە خۆی كرد بەژووردا، پاش سڵاوكردن، كۆتەرە دارەكانی لە ناو زۆپاكەدا هەڵچنی و بەدەم كەوتە فوولێ كردنی، لەوە دەچوو بیەوێ هەر بەپاشماوەی ژیلەمۆی شەوی زۆپاكە گڕیدا، چونكە ڕاستەوخۆ كەوتە فوولی كردنی .

ژوورەکە لە ماوەیەکی کەمدا بوو بەچرە دووکەڵی، خەریك بوو بەکابرا بڵێم کە بۆ چەرخێك یا شقارتەیەك بەکارناهێنیٚ، کە لەناکاودا زۆپاکە کڵپەی لیٚ هەڵسا، کابرا وەك کارێکی یەکجار گەورەی ئەنجام دابیٚ، سەری هێنایە دواوە و جگەرەیەکی زلی دەرهێنا و بەئاگری زۆپاکە دایگیرساند و پاشان زۆر بەخۆشییەوە وتی:

– کورینە لە سایەی خواوە، ئاسمان دەڵێی بەری دەستە!. ئەو رستەیەم هەر دەقا و دەق، بۆ هاوەڵەکەم کرد بەعەرەبی، بۆیە هیچ حاڵی نەبوو، پاشان بەپێکەنینەوە پێم وت:

– مەبەستی ئەوەیە کە ئاسمان سافە و هیچ هەوری پێوە نییە.

کەیبانووی ماڵەکە، تا ئەو کاتە دەنگی هەبوو، رەنگی نەبوو، بەسەبەتەیەك نانەوە خۆی کرد بەژووردا، کابرای خاوەن ماڵیش هاواری کچەکەی کرد کە چامان بۆ بهێنیٚ.

ئێمە تازە دەستمان کردبوو بەنان خواردن کە سەگەکانی دی، کەوتنەوە وەڕین، خاوەن ماڵ سەیری هەردووکمانی کرد و وتی:

– ئەوە «م» بەرەو ئێرە دیٚ!

دەستبەجیٚ ئێمەش دەستمان لە خواردن هەڵگرت، خاوەن ماڵ زۆری لیٚ کردین کە زیاتر بخۆین، چونکە ڕێمان دوورە، بەڵام ئێمە گەلیٚ سوپاسمان کرد، لە بەردەم هەیوانی ماڵەکەدا، ئامادە ڕاوەستا بووین و چاوەڕێمان دەکرد. کەیبانووی ماڵەکە، زۆر بەشەرمەوە، بەرەو ڕووم هات مشتیٚ کلۆشەکری دایە دەستم و لە ژێر لێوەوە وتی: ئەوە لەگەڵ خۆتان بەرن بۆ سەرما باشە.

ئەوەندە نەبوو کە لە هەیوانەکە ڕاوەستا بووین، کە «م» و چوار زەلامی تر گەیشتنە بەردەم ماڵەکە و پاش سلاو، «م» بیٚ پێشەکی وتی:

– حازرن؟

پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ «م» لە خورجەکەی کولێدا دوو جووت پوزەوانەی تازە و هەندێ پەڕۆپاتاڵی داینێ و پێی وتین:

– هەر ئێستە پوزەوانەکان بکەنە پێتان و پەڕوپاتاڵەکەش هەڵگرن، لەوێ پێویستتان دەبێ.

هەر خێرا پوزەوانەکەمان هەڵکێشا و خەریك بوو بکەوینە ڕێ کە خاوەن ماڵەکە بانگی «م»ی کرد و پریاسکەیەکی دایە دەست و پێی وت:

– بۆ ڕێگاتان، برسیتان دەبێ...

ورده ورده بەدەشتەکەدا کەوتینە ڕێ، لە پێشی پێشەوە یەکێك لە بەفر شکێنەرەکان، کە ناوی «هـ» بوو، سەر قافڵەمانی گرت، ئەو شتێکی سەیری بەستبوو بەژێر پێڵاوەکانییەوە، زیاتر لە دوو سەبەتەی بچکۆلانە دەچوو. لە ڕێ بۆمان دەرکەوت کە ئەو جۆرە پێڵاوە بۆ ناو بەفر گەلێ کاریگەر بوو.

بەریز یەك لە دوای یەك دەڕۆیشتین، من شەشەم کەس بووم، هاوەڵەکەشم دوایین کەس. تا ڕێگەکە دەگەیشتە سەر ئێمە، بەتەواوی بەفرەکە دەشکا و ئاسان دەبوو، بۆیە لە سەرەتای ڕۆیشتنەکەماندا هەستمان بەهیچ جۆرە هیلاکییەك نە دەکرد.

چیشتەنگاو گەیشتینە دەمی دەربەندەکە، بەفر تا دەهات ئەستوورتر دەبوو، لە ناو دەربەندەکەدا «هـ» ڕایگرتین پێی وتین:

– ناو دەربەندەکە زۆر لە دەشتەکە ساردترە، بۆیە هەموو جامانەکان لە سەر و گویلاکتانەوە بپێچن و پەڕۆپاتاڵەکانیش بەناو فەکتانەوە!

بەناو دەربەندەکەدا کەوتینە ڕێ، هەموو بێدەنگ بووین، تەنیا خرمە خرمی شکاندنی بەفر و مشەمشی خۆمان گوێ لێ دەبوو.

نێو دەربەندەکە دۆڵێکی دوورودرێژ بوو کە دەکەوتە نێوان دوو شاخی

زۆر بەرزەوە، سەر لووتکەی شاخەکان بەئاستەم تیشکی خۆر، خۆی تێ دەسوون. هەموو شتێ لەو دۆڵەدا هەر سپی دەچووەوە و سەرتاسەریشی سێبەر دایگرتبووەوە و کزە بایەکی زۆر ساردیشی دەهات، بۆیە من سەرەڕای جامانەکە کە پێچابووم لە دەمولووتمەوە، دەستیشم گرتبوو، بەسەر لووتمەوە!.

دەمەو نیوەڕۆ، لە ناکاودا «هـ» دەنگی داین و وتی:

– بوەستن!

هەموو ڕاوەستاین و بەسەرسووڕمانەوە سەیری «هـ»مان دەکرد، ئەویش چەندجارێ بەپەلە خۆی چەماندنەوە و سەیری بەفرەکەی بەردەمی خۆی کرد. من وامدەزانی شتی لێ کەوتووە یان بەدوای شتێکدا دەگەڕێ، خۆی قیت کردەوە و زۆر سەرکەوتووانە وتی:

– دیارە ئەم بەیانییە، پیش ئێمە، خەڵکی تر لێرەوە تێ پەڕیون!.

ئەمەی وت و لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بووینەوە، لە ڕێگا چرپاندم بەگوێی «م»دا پێم وت:

– کێ دەڵێ خەڵکی ئەودیو نەهاتوون و ڕێگەیان بۆ نەشکاندووین؟

«م» بزەیەك گرتی و بەدەم ڕۆیشتنەوە وتی:

– نا. هەر لەم دیوەوە خەڵك ڕۆیشتوون، چونکە بەجێ پێکاندا دیارە ڕووەو کێوە ڕۆیشتوون.

شەرمم کرد لەو پرسیارە ناشییانەی کە کردم، چونکە دیارە بەشوێن پێدا دەردەکەوێ، کە هاتوچۆ کەران ڕووەو کێوە ڕۆیشتوون. ئێمە وردە وردە بەناو دۆڵەکەدا سەر دەکەوتین، کە لە پێشمانەوە چەند چەکدارێك بەرەو ڕوومان سەرەو خوار دەهاتن، هەموو بەبینینیان واقیان وڕما. کاتێ نزیك کەوتنەوە لێمان، پێنج چەکدار بوون و یەکێکیان یەکسەر تێی خوڕین:

– کێن زەلام؟

«م» یەکسەر هەڵیدایە و وتی:

– من خەڵکی ئەودیوم و ئەوانی تریش ئێرانین!

یەکێ لە چەکدارەکان کە لەوە دەچوو لێپرسراویان بێت، هاتە پێشەوە لێمان، ئەوانی تریش هەر دووانیان بن بەردێکیان لێ گرتین.

من بەوردی ڕوانیمە چەکدارەکان، کەسیانم نەدەناسی و نەشمدەزانی سەر بەکێن، تا ئەوەی هاتە بەردەممان و پێی وتین:

– ئێمە پێشمەرگەین!

ئەمەی وت و دەنگی چەکدارەکانی تری دا کە هەستنە سەر پێ. من لە لای خۆمەوە هەستم بەدڵخورتییەك کرد و لە دڵی خۆمدا وتم:

– ئەمجارەش تووش بووینەوە!

لێپرسراوەکەیان زۆر بەوردی سەرنجی منی دەدا، تۆزێ لێم هاتە پێشەوە و بەسەرسووڕمانەوە وتی:

– ئێوە کێن و خەڵکی کوێن؟

منیش ڕاستەوخۆ وتم:

– جەعفەر، خەڵکی مەهاباد.

لێپرسراوەکە وتی:

– بۆ کوێ تەشریف دەبەن؟

لە وەڵامدا وتم:

– بۆ ئەودیو...

سەیری زەلامەکانی تری کرد کە لەگەڵمدا بوون، پاشان وتی:

– بۆ؟

منیش یەکسەر وتم:

– بۆ چەك کڕین!

کابرا بەسەرسووڕمانەوە وتی:

– بۆ کێ؟

ماوەیەك دامام، لە ڕاستیدا نەمدەزانی چی بڵێم، پاشان وتم:

– بۆ خۆمان!

لێپرسراوەکە چاوی بەناو هەمووماندا دەگێڕا، وتی:

– خۆتان کێن؟...

منیش زۆر بەسادەیی وتم:

– خۆمان! کوردی ئێران!

لێپرسراوەکە زەردە خەنەیەك گرتی و وتی:

– بۆ؟...

منیش زۆر بەجیدییەوە وتم:

– بۆ دژایەتیی شای ئێران.

لێپرسراوەکە بەتەوسەوە وتی:

– توخوا؟

منیش هەر تەواو خۆم گێل کرد و وتم:

– بەخوا!

لێپرسراوەکە یەکسەر دایە قاقای پێکەنین و زیاتر هاتە پێشەوە لێم و پێی وتم:

– تۆ ئەوە نەبوویت کە «میوانمان» بوویت لە پێداو!!

کە ناوەکەمی وت، یەکسەر واقم ورِما و ئینجا بیرم کەوتەوە، هەموو چەند مانگێك لەوەوبەر بوو کە لەگەڵ «ئەواندا» تووشی شەڕێکی یەکجار قورس و گران بووبووین لە دێی (بازێ) بۆیە منیش ئیتر نکۆڵیم نەکرد و لە وەڵامدا وتم:

– بەڵێ ڕاستە...

پاشان لێپرسراوەکە، پێی ڕاگەیاندین کە مادام ئێمە بە ناوچەی ئەواندا تێ دەپەڕین، پێویستە ڕوخسەتی ئەوانمان پێ بێ. ماوەیەك کەوتینە وتووێژ.

پاشان وەك سازانێك بە لێپرسراوەکەم وت:

– باشە ئێمە ئێستە، جارێ لەدیوی ئێرانین. دیارە کە چووینە ئەودیو، برادەرانتان دەبینین و لەوێ داوای ڕووخسەتیان لێ دەکەین. ئەگەر هێشتیان بڕۆین، ئەوا دەڕۆین، ئەگەر نا، دەگەڕێینەوە.

لێپرسراوەکە ڕاکەمی قبووڵ کرد، جا نازانم لەبەرئەوە بوو کە بڕوای نە دەکرد ئێمە بتوانین ئەو شاخە سەختە ببڕین کە ئەوان خۆیان لێ دابوو، نەیانتوانیبوو، گەڕابوونەوە، یان هەر ویستی مۆڵەتمان بدات بڕۆین.

بەهەرحاڵ کەوتینە ڕێگا، بەڵام ئەمجارەیان تا ڕادەیەکیش عەزممان شکابوو، بەوەی کە پێش ئێمە هەوڵدرا بوو ڕێ بشکێنرێ و سەرنەکەوتبوون.

ئێمە لەسەر ڕۆیشتنەکەمان بەردەوام بووین، هەوا تا دەهات ساردی دەکرد بۆیە سەیرێکی ئاسمانم کرد، ئاسمان گەواڵە گەواڵە هەوری دەگرت و تا دەهاتیش چڕتر و تاریکتر دەبوو، جاروبار بۆ دڵنیایی ئاوڕم لە هاوەڵەکەم دەدایەوە، دیار بوو تۆزە تۆزە هیلاکی و شەکەتی سەری، لێ هەڵدەدا، بۆیە لە ئاوڕدانەوەیەکدا پێی وتم:

چەند سەعاتمان ماوە بگەین؟

لە ڕاستیدا ڕێگەکە خۆی بەڕۆژی ئاسایی هەر هەشت سەعات دەبوو، بەڵام لە ڕۆژێکی وادا پیاو نەیدەتوانی وەخت دیاری بکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بۆ هێور کردنەوەی وتم:

– دەمەو ئێوارێ هەر دەگەین.

پاش نیوەڕۆ پروشەی بەفر دەستی پێ کرد، لە سەرەتادا بەکەمی، بەڵام تا دەهات زیاتر دەبوو، تا دەشچووینە پێشەوە بەفرەکە ئەستوورتر دەبوو، کاتێ گەیشتینە قەد پاڵی شاخەکە، کە دەبوو پێش ئێوارێ پیا سەرکەوین، تەواو شەکەت بووین، بەتایبەتی هاوەڵەکەم کە قاچەکانی بەدوای خۆیدا زۆر بەزەحمەت ڕادەکێشا.

هێدی هێدی بەشاخەکەدا، ملی سەرەو ژوورمان گرت، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە پێشمانەوە ڕێگەیان بۆ دەشکاندین، هەر بۆ ئێمە، بەتایبەتی بۆ هاوەڵەکەم، سەخت بوو.

ئەو تەواو هەناسە برکێی پێ کەوتبوو، لە کاروانەکەشمان تا دەهات دوا دەکەوت، بۆیە چەند جارێ ڕاوەستام تا پشووی بەخۆیدا بێتەوە، پاشان دەکەوتینە ڕێ. تا بەرەو سەروو دەڕۆیشتین، بەفر خەستتر دەباری، هاوەڵەکەم جارویار دەکەوت و منیش لەگەڵ شەکەتیی خۆمدا، پەلامارم دەدا و هەڵم دەستاندەوە.

ڕەشەبایەکی توند هەڵی کرد، بەفرەکەی لوول دەدا و دەیدا بەچڕوچاوماندا، دەنگە دەنگ کەوتە ناو بەفر شکێنەرەکانەوە، هەریەکەو مەترسیی خۆی بەجۆری نیشان دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەر داوایان دەکرد کە خێراتر بڕۆین. هاوەڵەکەم تەواو پەکی کەوتبوو، چەند جارێ هاواری لێ کردم کە ناتوانێ زیاتر ڕێ بکات، بەڵام من هەر ورەم دەدایە بەری و جارویاریش لەتە کلۆیەك شەکرم دەدایە.

گەیشتبووینە ناوەڕاستی شاخەکە، گەردەلوولی ڕەشەبا، هەموو جارێ بۆ ماوەیەك لە جێی خۆمانی قەتیس دەکردین.

هاوەڵەکەم هەر ئاخ و ئۆف و ناڵە و باوکە ڕۆی بوو، کە لە پڕێکا یەکتەختە لەسەر بەفرەکە لێی کەوت، بۆیە منیش هاواری بەفر شکێنەرەکان و «م»م کرد. هەموو دەوری هاوەڵەکەماندا، «هـ» بەدەستی کەوتە ڕاوەشاندنی دەستوپەلی، یەکێکیش کەوتە شێلاندنی قاچوقولی، بەلاَم ئەو، بێ جووڵە، لێی کەوتبوو، بەحاڵ زمانی دەبزواند.

گەردەلوولی بەفرەکە چەند جارێك لوولی داین و تێکڕا سەروچاوی هاوەڵەکەمی پڕکردەوە. بەدەستی ئیشارەتی بۆ دەکردم، بۆیە منیش خۆم نەوی کرد و گوێم نایە پەنا دەمیەوە، بەزەحمەت پێی وتم:

– دەمرم. دەمرم... بەجێم بهێڵن!

بەفری وای نەدیبوو، بەفرەکە لای خۆمان هەرگیز لەگەڵ ئەم تووشی و زریانەدا بەراورد نەدەکرا، ئەوە سەرەڕای ئەوەش کە خۆی خەڵکی خوارووی عێراق بوو.

گەردەلوولی بەفرەکە لەمبەر شاخەکەوە دەیدا بەویەردا و لێشاوی بەفریشی بەسەر گوێلاکی ئێمەدا دەدا. ئەو هەر کەوتبوو، هەموو لەگەڵیدا هەوڵمان دەدا، ڕامان دەوەشاند و هیمەتمان وەبەر دەدا. بێهوودە بوو، لە جێی خۆی هەر نەدەجووڵاند، بۆیە بەبەفر شکێنەرەکانم وت:

– چار چییە؟ چی بکەین؟

هەموو سەرسام ئەبلەق تێیان دەڕوانیم، لەوە دەچوو چاوەڕێی من بن پێشنیارێك بکەم کە «هـ» وتی:

– با بگەڕێینەوە! گەر نا هەموو دەمرین!

هەموو سەیری یەکتریمان کرد. «م» ڕووی کردە من، وتی:

– ئەی تۆ چی دەڵێیت؟

لە ڕاستیدا نەمدەزانی چی بڵێم، پرسیارێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، حەوت سەعات بەو بەفرەدا بەرێوە بووین، گەڕانەوەش شەش حەوتێکی تری هەر دەویست بۆیە بە «م» وت:

بەچەند سەعاتی تر دەگەینە سەر لووتکەی شاخەکە؟

سەری بۆ لووتکەی شاخەکە هەڵبڕی وتی:

– هەر دوو سەعاتی تر دەخایەنێ.

لەسەر چۆك لە تەنیشت هاوەڵەکەمەوە هەڵتڕووشکام، سەرم نایە پەنا گوێی و تکای ئەوەم لێ کرد، کە هەر چۆنێك بێت هیمەتێك بداتە بەرخۆی.

بێدەنگ سەری نارەزایی دەبزواند، یەکجار کەساس و کەسیرە و پەککەوتە دەهاتە پێش چاو، ڕەنگی تەواو زەرد هەڵگەڕابوو، لێوەکانی شین و قڵیشاو بوون، شەختەی بەفر سمێڵ و برۆکانی داپۆشیبوونە. نەترووسکایی و نەهیچ سیمایەکی وزە لە سەروچاویدا بەدی دەکرا. لەوە نەدەچوو بەهیچ شێوەیەك ڕێ ڕۆیشتنی پێ مابێ، بۆیە بە«م»م وت:

– باشتروایە ئەم برادەرانە لەگەڵیدا بگەڕێنەوە بۆ ناودێ. سەیری جەستە شەکەت و لاوازەکەی بەردەمم کرد و بەردەوام بووم!

– هەر کاتێ ڕێ شکێندرا، بێینەوە بۆ ئەودیو بۆ کوردستانی تورکیا.

پێشنیارەکەم لای هەمووان سەرسووڕهێنەر بوو، لەوە نەدەچوو بڕوا بکەن، حەوت سەعات، لەو کرێوەیەدا، بەفرشکاندن و ئێستاش، گەڕانەوە؟! بەڵام کە بۆ جاری دووەم، دووپاتم کردەوە، ئیتر گومانیان لە بڕیاری بنجبڕم نەماو سەری ڕەزامەندییان بۆ لەقاندم.

پەلی هاوەڵەکەمیان گرت و بەناو بەفرەکەدا، سەرەو خوار کێشیان کرد، بۆیە هاوارم لێ کردن.

– ڕاكێشان ماناى چى؟

یەكێ لە بەفرشكێنەرەكان لە وەڵامدا وتى:

– كاكى برا، ئەمە سەر بەرەو خوارە و بۆمان ناكرێتە كۆڵ، هەر لەم داگەڕانە ڕزگار بووین، ئیتر ئاسوودە بن، دڵتان هیچ نەكات، بەكۆڵ دەیگەینینە ناو دێ.

كە لەوان جیابووینەوە ورد ورد بەشاخەكەدا هەڵدەزناین، ئەمجارەیان ڕەوتمان گەلێ سەختر بوو. زریانى بەفر لەگەڵ هەر سەركەوتنێكماندا بەهێزتر دەبوو، جارى وا هەبوو چەند مەترى دەیگێڕاینە دواوە و ناوبەناو «م» دەیوت:

– بەقوربانە دەست و بردكە، هەر بگەینە سەر شاخەكە ئیتر تەواو، ئەودیوە تەنیا داگەڕانە.

بۆیە منیش هەموو هێز و توانام دەدایە خۆم و بەچنگەكڕى و هەندێ جار بەسنگەخشكى بەشاخەكەدا دەكەوتمەوە ڕێ، تا بەرەو لووتكەى شاخەكەش سەر دەكەوتین بەفر تەنكتر دەبووەوە، بەڵام ڕەشەبا و گەردەلوول بەهێزتر دەبوو، ماوەیەكى مابوو بۆ سەر لووتكەكە، كە هەستم بەوە دەكرد كە جێ پێكانمان تەواو لووس بوون و سەركەوتنیش، بەو پێیە، زەحمەتترە. هەردووكمان بەسنگەخشكێ دەڕۆیشتین، دەستەكانم تەزى بوون، لێوەكانم بۆ نەدەبزوا، پیلوى چاوەكانم بەفر گرتبوونى، بەر لووتم یەك پارچە بوو بوو بەسەهۆڵ، تاوە تاوە لەتە كڵۆیەك شەكرم لە گیرفانم دەردەهێنا و دەمنایە ناو دەممەوە، لە ڕاستیدا هیچ سەیتەرەم بەسەر لێوەكانمدا نەمابوو، چونكە چەند جارێ لە تەكڵوكان لە دەمم دەكەوتنە خوارێ. «م» ناو بەناو ئاوڕى لێ دەدامەوە و بەدەمێكى لەرزۆكەوە دەیوت:

– بەقوربانت بم هەر تۆزێكمان ماوە دەگەینە سەر لووتكەكە. وردە وردە نزیك لووتكەكە دەكەوتینەوە، گەردەلووكە ئەوەندە بەهێز بوو كە من تەواو

ترسی ئەوەم لێ نیشت، کە جارێ بەیەکجارەکی، بۆ ناو دۆڵەکە فڕێمداتە خوارێ و هەپرون بە هەپڕون دەبین، هەر بۆیەش هێندە توند چنگم لە بەفرەکە گیر دەکرد.

چەند جارێك لە پەلوپۆ کەوتم و تەنیا بەهاندانی «م»، کە لە پێشمەوە سنگەخشکێی دەکرد، دەکەوتمەوە ڕەوت.

لووتکەی شاخەکە بەڕوونی دەبینرا، لەگەڵ ئەوەشدا هەر نەدەگەیشتین، بۆیە خەریك بوو بگەمە ئەو بڕوایەی کە دەبێت هەردووکمان دووچاری تراویلکە بووبین، گەرنا، بۆ هەر نەدەگەیشتین.

هێشتا سەد مەترێکمان مابوو بۆ سەر لووتکەکە، من بەتەواوی لە پەلوپۆ کەوتم، دڵم ئەوەندە بەتوندی لێی دەدا، کە دەنگەی لە سەرمەوە دەهێنا، دەموت هانا، ها ئێستە لە قەفەزەی سنگمەوە دەردەپەڕێت.

بەرچاوم تاریك بوو، هیچم بەباشی بۆ بەدی نەدەکرا، یەك دووجار سەرم دای بەبەفرەکەی بەردەممدا و خەریك بوو خەوی یەکجارەکیم لێ بخا.

«م» پاشەوپاش گەڕایەوە و چەند جارێك ڕای وەشاندم و بەدەنگی بەرز هاواری لێ کردم.

– بەقوربانە هەر ئەم تۆزە... کوڕە وا گەیشتین.

چاوم بەئەزیەت هەڵهێنا و نواڕیمە سەروچاوی «م»، زۆر سەیر هاتە پێش چاوم، سەروپوتەلاکی یەك پارچە بووبوو بەشەختەی بەفر و سمێڵ و بڕۆکانی تێکڕا سەهۆڵ گرتبوونی.

بەنووزەوە پێم وت کە کلۆێك شەکر لە گیرفانم دەربهێنێ و بیخاتە سەر زمانم و ئەویش دەستبەجێ، شارەزایانە، ڕاسپاردەکەمی جێبەجێ کرد، هەر پاش کرۆشتنی شەکرەکە، ڕاستەوخۆ وزە و توانام پیاهاتەوە و خستمیەوە سنگەخشکێ.

هەر چۆنێك بوو گەیشتینە سەر لووتکەی شاخەکە و لەوێوە سەیری دۆڵەکەی خوارمانەوە کرد. چ هەزار بەهەزارێك بوو، هەرگیز بڕوام نەدەکرد کە ئێمە توانیبیتمان بەو شاخەدا سەرکەوتبین. لەو سەرەوە لابەلای لووس و ڕژد و سەختی شاخەکە بەدی دەکرا.

سەرما دەرزی ئاژنی سەروو ڕووی دەکردین، بۆیە زۆر بەسەر لووتکەکەوە نەماینەوە و بەپەلە داگەڕاین. هەر ئەودیوی لووتکەکە بووین ئیتر زریان و ڕەشەبا و گەردەلوولی بەفر نەما. ئەم دیو شاخەکە، بای بەفر، نەی دەگرتەوە.

ماوەیەك خۆمان دایە پاڵ گابەردێکی گەورە کە لاتەنیشتی بەفر زۆر داینەگرتبووە و بۆ ساتێك پشوومان دا.

من هەر تەواو ماندوو کەسیرە بووم، بەڵام «م» هێشتا گوڕوتینی هەر تێدا مابوو، دەستی دا بەسەر شانمدا و وتی:

– وا چاکە بکەوینەوە ڕێ، با شەومان بەسەر نەیەت.

بەناچاری تێنم دایەوە خۆم و بەشاخەکەدا داگەڕاین، کارێکی ستەم بوو، هەر لە یەکەم هەنگاودا، بەفر تا ناوەندی «م» هات. لە سەرەتا بڕوام نەکرد، بەڵام کاتێ هەنگاوی دووەمی نا ئیدی گومانم نەما.

«م» ئاوڕێکی پڕ بەزەییانەی لێ دامەوە و زۆر بەکەساسییەوە وتی:

– دیارە ئەمدیو شاخەکە نسێیە و بەفر تەواو گرتوویەتەوە. ساتێ بێ دەنگ بوو، پاشان هەر بۆ دڵنیاییم بەردەوام بوو:

بەڵام گرنگ نییە! سەر بەرەو خوارێیە!

هیچم نەوت. لەو هیلاکەتییەی مندا شێلانی بەفر بەو شێوەیە مەحاڵ بوو. «م» هەر خۆی دەکوتا، بۆیە منیش بەناڕەزاییەوە دوای کەوتم.

لە ڕاستیدا ڕیشکاندنێکی بێ ئەندازە زەحمەت بوو، بشمزانیبایە بەو

ڕادەیە دووچاری ئەزیەت دەبین، هەرگیز ملم نەدەنا و لەگەڵ ئەوانی تردا، بێ سێ و دوو دەگەڕامەوە، بەڵام تازە چیم بکردایە.

بەهەرحاڵ ناچار بووین بڕۆین، کاتێ سەیری کاتژمێرەکەم کرد، تەنیا یەك سەعات ڕۆژی مابوو، بۆیە منیش هەرچی تین و توانا و وزەم هەیە دامە بەرخۆم و بەجێ پێکانی «م»دا درم بەبەفرەکە دەدا.

سەیرێکی دەوروپشتی خۆم کرد، هەتا چاو برکات هەر بەفر بوو، هەموو دنیا سپی دەچووەوە، هیچ شتێکی وام لەو دەوروبەرەدا بەدی نەدەکرد کە نیشانەی ژیان و ئاوەدانیی پێوە دیار بێت.

ئەگەرچی بەڕواڵەت جەستە خەستە و بێ هێز، دەمنواند، بەڵام دۆخی دەروونیم گەلێ لەودیوە چاتر بوو.

تاریکی وردە وردە دەهات، لەگەڵ ئەوەشدا دەوروپشتمان هەر ڕووناك بوو، سپیایی ئەو هەموو بەفرە تەنانەت بەشەوێکی وا تاریك و نووتەکیش هەر دانەدەپۆشرا.

لەمدیو بەفر نەدەباری، لەوە دەچوو بەفرەکەی ئەودیویش زیاتر ئەنجامی ڕەشەباکە خۆی بووبیت، کە بەفری سەر لووتکەی شاخەکانی لوول دەدا و دەیکرد بەناو دۆڵ و لاپالی شاخەکەدا و پاشانیش دەیهێنا و بەسەروچاوی ئێمەیدا دەکێشا.

یەك سەعات بوو بەڕێوە بووین کە لە دۆڵەکەی خوارمانەوە چەند پەڵە ڕەشاییەکمان بەدی کرد. «م» هاواری لێ هەستا و وتی:

– بڕوانە، خەریکە دەگەینە ئاوەدانی.

ئەمەی وت تفەنگەکەی سەرشانی داگرت و دووسێ فیشەکەی، لە خۆشیدا، ڕووەو ئاسمان گرڕدا.

کەوتینەوە ڕێ، تا بەرەو خوارتر دەبووینەوە، بەفر کەمتر دەبووەوە، بەڵام

هەر لە ئەژنۆمان نەدەهاتە خوار! «م» وەك بەبینینی ئەو پەڵە ڕەشاییانەی خوارمانەوە، هێزێکی نادیاری تیا پەیدا بووبێت، زۆر لەوەو پێش خێراتر دەڕۆیشت و لە ماوەیەکی کەمدا سی چل هەنگاویّ لێم دوورکەوتەوە. من سەرگەرمی بەفر شکاندن بووم کە بەدەنگێکی بەرز پێی وتم:

– من تۆزیّ خێرا دەڕۆم، بەڵکو بەزوویی بگەمە ناو دێی «گەلیشم» و لەوێوە وڵاخێك و چەند کەسێکت بۆ بنێرم. من بێدەنگ بووم، پاش ساتیّ دووبارە هاواری کرد:

– تۆش هەر بەجیّ پێکانی مندا وەرە خواریّ!

ئەوەی وت و هیچ چاوەڕێی وەڵامی منی نەکرد و کەوتەوە ڕیّ، بەڵام ئەمجارەیان گەلیّ خێراتر، بەڕاستی تیّ نەدەگەیشتم کە چۆن ئەو دەتوانێت، دوای ئەو هەموو هیلاکییە، وا خێرا بڕوات... چ وزەیەکی نادیار لە جەستەی (م)دا بوو.

من هەر تەواو پەکم کەوتبوو، ئەوەی باش بوو سەر بەرەو خواری بوو، ڕەشاییش لە نێو دۆڵەکەدا بەدی دەکرا، ئەوەش کە بۆ من بزوێنەرێکی لەباربوو، بۆیە بەردەوام هەر تەکانم بەخۆم دەدا.

لە ماوەیەکی کورتدا «م» لە بەرچاو ون بوو، منیش لەسەرخۆ– لە ڕاستیدا هەر ئەوەندە وزەم پیّ مابوو– بەشاخەکەدا، داگەڕام، تا دەشهاتمە خوارەوە، ناو دۆڵەکە چاکتر بەدی دەکرا، هەچۆنێك بوو خۆم گەیاندە نێو دۆڵکە. جۆگەیەك، سەرەو خوار سەرچاوەی بەست بوو، هەردوو کەناری پڕ بوون لە دەوەن، بەفرەکە تا دەهات تەنکتر دەبوو، بەڵام من لەوزە بەدەر هیلاك بووم. چەند جارێك لە قەراخ جۆگەکە، لەسەر تاوێرە بەردێك دادەنیشتم و پشووم دەدا.

ناو دۆڵەکە گەلێك سامناك و بەتەواوی تاریك بوو، بەرچاوی خۆم بەباشی بەدی نەدەکرد، هەر ئەوەش بوو کە وای لیّ کردم قەراغی جۆگەکە

بەرنەدەم و لێی دوور نەکەومەوە. چونکە - وەك تاقیکردنەوەی پێشمەرگایەتی - دەمزانی جۆگەی ئاو هەر پیاو دەگەیەنێتە ئاوەدانی.

خورەی ئاو سەر بەرەو خوار، تەنیا دەنگێك بوو کە لەو دۆڵە چۆڵ و تاریکەدا دەبیسترا، نەمدەزانی چەند دەبێت کە بەقەراغی جۆگەکەدا دەڕۆیشتم کە لە دوورەوە ڕۆشناییەکم هاتە بەرچاو، لە بریسکەی ئەستێرەیەکی دووری دەکرد، لە سەرەتادا زۆر سەرسام بووم، بەڵام پاش تاوێك لەوە گەیشتم کە دەشێ خەڵکی ئاواییەکە بیت، کە بەرەو پیرم دێن. ڕۆشناییەکە تا دەهات نزیکتر دەبووەوە و تاریکیی نێو دۆڵەکەش، کەم کەم، دەڕەوایەوە.

ئەوەندەی نەبرد، تارمایی چوار زەلام، کە یەکێکیان لۆکسێکی بەدەستەوە بوو بەدی کرد، یەکێکیان وڵاخێکی پێش خۆی دابوو، کە تەواو نزیك کەوتنەوە، خورپەی خوشییەك سەراپای گیانمی گرتەوە. کاتێ گەیشتنە لام، زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنیان لێ کردم، یەکێکیان، پریاسکەیەکی کردوە و پارویەك نان و پەنیری دایە دەستم، ئەوانی تریش. بەتانییەك، کە دابوویان بەپشتی وڵاخەکەدا داگرت و دایان بەشانمدا و پاشان سواری وڵاخەکەیان کردم. یەکێکیان جڵەوی وڵاخەکەی ڕادەکێشا و لۆکس بەدەستەکەش، لە پێشمانەوە، هەنگاوی گورج و پتەوی دەنا و دوانەکەی تریش، کە سەروپۆتەلاکی خۆیان، بەجامانە، داپۆشیبوو، بەملاولای وڵاخەکەدا ملی ڕێیان گرتەبەر. خرمەی بەفری بەستووی ژێر سمی وڵاخەکە، ئیقاعێکی یەك نەواختی دەدایە بەرگوێمان. یەکێك لەوانەی تەنیشتم، جامانەکەی لەسەر دەمی لابرد و وتی:

- باشە ئێوە چۆن بەم ڕۆژە تووشە و لەم زریانەدا وێراوتانە خۆتان لە قەرەی ئەم شاخە سەختە بدەن.

هیلاك و کفت و شەکەت و بێ تاقەت بووم، بەهەزار حاڵ خۆم بەسەر

وڵاخەکەوە ڕاگیر دەکرد. لە وەڵامدا لە ژێر لێوەوە وتم:

– ئەوە لە کاک «م» بپرسن!

ڕاستیان دەکرد، لە ناوەڕاستی مانگی دیسەمبەردا، کێ سەرە ڕۆیی وا دەکات، و بەڕۆژێکی وا تووش، خۆی دووچاری شاخێکی وا بەرز، لە کوێستاندا، دەکات.

کابرای تەنیشتم ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان بێ ئەوەی ڕووم تێ بکات ، وتی:

– بەهەرحاڵ، کارێکی لە ئەقڵ بەدەرتان ئەنجام داوە. تا ئێستە نەبیستراوە کەسێك لە مانگی دوانزەدا، لەم سنوورەوە، هاتبێتە ئەمدیو!

قافلەکەمان ورد ورد دەڕۆیشت، هەموو بیدەنگ بووین، کە لەناکاودا سەگوەڕێك ڕایچڵەکاندم، ئەگەرچی سەگوەڕ، زۆرجار، وەزع لە پێشمەرگە تێك دەدات، هەرواش زۆر کەڕەت دەبێتە مایەی دڵخۆشی، چونکە سەگوەڕ یانی ئاوەدانی.

کاتێ گەیشتینە ناو دێ، سەگەکان دەوری وڵاخەکەمیان دا، نەیاندەهێشت دابەزم، بۆیە یەکیك لە پیاوەکانی تەنیشتم، پڕی دایە کۆتەرە دارێك و سەگەکانی لێ دوور خستەوە.

خەڵکی ناو دێ زۆربەیان هاتبوونە دەرەوە، هاتنی غەریبەیەك لەو شاخەوە کارێکی ئاسایی نەبوو، خەڵکەکە بەرەو پیرمەوە هاتن، یەکێکیان زۆر بەڕێزەوە پێی وتم:

– فەرموو، دابەزە مامۆستا!

کە جوان سەرنجم دا «م» خۆی بوو، پاك و تەمیز و پوشتە و پەرداخ و زپ و زیت هاتە پیش چاوم، دەتوت ئەسڵەن ئەو هەر بەو شاخەدا تێ نەپەڕیوە!. چۆن فریاکەوت وا زوو خۆی بگۆڕێ؟ لە وڵاخەکە دایانگرتم،

قاچەکانم تەواو گۆت بووبوون، خۆم بەپێوە نەدەگرت، بۆیە دوو پیاو هاتنە ژێر باڵم و بردمیانە ناو ماڵێکەوە، دیار بوو «م» زۆر بەسەلیقانە، پێش ئەوەی من بگەمە دێ، هەموو شتێکی ئامادە کردبوو.

بەچرپە بە «م»م وت:

– کوێیە ئێرە؟

لە وەڵامدا بەپێکەنینەوە وتی:

– ئێرە بەحیساب تورکیایە و ئەم دێیەش (گەلیشمە).

تورکیا؟ زۆر لەسەری نەڕۆیشتم، دیار بوو سنوورمان شکاندبوو، بەڵام بەهۆی بەفرەوە میلەکانی سنوورمان نەدی بوو.

زۆپای ماڵەکە گرمەی دەهات، خاوەن ماڵیش خێرا خێرا، بەمەقاشێك ئاگرەکەی سەرەو ژێر دەکرد. هەر زوو هەستم بەتینی ئاگری ژوورەکە کرد.

خاوەن ماڵ تەشتێك ئاوی گەرمی هێنایە بەردەمم و لەگەڵ «م» دا هەوڵیان دا پوورزەوانەکانم – کە خۆم نەمدەتوانی – لە پێ دابکەنن، هەوڵێکی بێ سوود بوو، بەهیچ جۆرێك دانەدەکەندرا، خوریی پوزەوانەکە چوو بووەوە یەك، کە ناچار بووم، داوای چەقۆیەك بکەم، بەڵام خاوەن ماڵ وەك پیاوێکی دنیا دیدە، کە زۆر لەو بابەتەی منی دەبینێت وتی:

– یەك سەعاتی تر پوورزەوانەکانت وشك دەبنەوە و بەئاسانی دادەکەندرێن. حەیفە، لە هیچە، مەیاندڕێنە.

ئەو شەوە زۆربەی خەڵکی دێ هاتنە لام، هەموشیان، گەلێك بەو کارەمان سەرسام بوون، یەکێ لە دانیشتوانی گوندەکە وتی:–

– ئێمەی گوندی لەگەڵ ئازار و سەختیدا پەروەردە بووین.

ئیشارەتی بۆ «م» کرد و ڕووی کردە من .

– ئەوا ئەو قەیناکە... خۆی کوڕی ئەم هەردوو کێوەیە... ئەی توخۆت بۆ تووشی ئەم گێرمە و کێشەیە کرد؟

خەریك بووم وەلامی بدەمەوە کە «م» بەشانازییەوە وتی:

– هەڤاڵیشمان پێشمەرگەیە.

کە دانیشتووان زانییان پێشمەرگەم، ئیتر هیچ سەریان سووڕنەما. کەسێك ببێتە پێشمەرگە ئیتر سڵ لە شاخ و کێو و سەرما سۆڵە و نارەحەتی ناکات، ئەوە بەڵگە نەویست بوو.

خەڵکی ئاوایی یەك لە دوای یەك بەجێیان هێشتین. خانمی ماڵ، شوربایەکی گەرمی بۆ هێنایین. یەك دوو کەوچکم خوارد. ئەگەرچی لە سەرتاسەری ئەو ڕۆژەدا – جگە لەو پارووە پەنیرەی کە پێشوازی کەرانم بۆیان هێنام – هیچی ترم نەخواردبوو، کەچی ئەوەندەم بۆ نەخورا. بەڕادەیەك خاوەن ماڵەکە بە سەرسووڕمانەوە تێی ڕوانیم و وەك هاندانێك وتی:

کەسێك لەم زستانە سەختەدا، کێوێکی وا وزە بەزینی لە ڕۆژێکی وا سەرما و تووشدا بڕیبێت، چۆن وابەقەدەر چۆلەکەیەك نان دەخوات؟

وەلامم پێ نەبوو. داوای لێبوردنم لێ کرد، ڕادیویەك کە لە نزیکمەوە دانرابوو سەرنجی ڕاکێشام، دەستم دایەوە، بەپەلە میلی ڕادیۆکەم گێڕا، هەواڵەکانی ئێران و خۆپیشاندانی خەڵکی دژی ڕژێمی شا، لە هەموو ئیستگەکانی جیهان باس دەکران و سەرەتای کۆتاییی ڕژێمی گەندەلی شای شایان بەڕوونی ڕادەگەیاند، هەموو جموجۆڵەکانی خەڵکی ڕاپەڕیو و خرۆشاوی نێو ئێران، هەر ئەوەیان دەسەلماند، کە عەرشی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەی کوورشی کە بیر – ئیتر مەحاڵە بتوانێت بەردەوام بیت.!

خەوێکی قورس تینی بۆ هێنام، هەواڵە دڵخۆشکەرەکان و وزە هێنەرەکانی نێو ئێرانیش هێرشی وەنەوزمی بۆ ڕانەدەگیرا، پیلوی

چاوەکانم بەئەزیەت بۆ هەڵدەبڕدرا، لەوە دەچوو خاوەن ماڵ هەستی بەڕادەی شەکەتیم کردبێت، چونکە ڕاپەڕی و دوشەکێکی بۆ هێنام، زۆر هەوڵی دا لەسەری بنووم، بەڵام من ڕازی نەبووم، تەنیا داوای بەتانییەکم کرد و هەر لە جێی خۆم ڕاکشام.

«م» چراکەی کز کرد و چەند لەتەدارێکی هاویشتیە ناو زۆپاکەوە و لە سووچێکی ژوورەکەدا خۆی لە لێفەیەکەوە گرمۆڵە کرد. تیشکی گڕی زۆپاکە بەسەر دیوارکەی بەرامبەرمەوە سەمای دەکرد.

بەیانی زوو – دوای سووکە بەرچاییەك – لە دێ دەرپەڕین، ئەویش لەسەر پێشنیاری «م» بوو کە دەیوت:

– ئێرە تورکیایە و پیاو دەبێت زۆر وشیار بێت.

بەقەراخ جۆگەکەدا سەر بەرەو خوار بووینەوە، بەفر ئەو ناوەی ئەوەندە نەگرتبووەوە، تەنیا پەڵە پەڵە، لێرە و لەوێ بەدی دەکرا، دار و دەوەنێکی زۆر ئەمبەر و ئەوبەری جۆگەکەی تەنیبوو.

ماوەیەك بەڕێوە بووین، سەرم بۆ ئاسمان هەڵبڕی، شین و ساف و بێ گەرد بوو، تا ئەو کاتە هەستم بەوە نەکرد بوو کە چ ڕۆژێکی خۆشە – هەر لە زستان نە دەچوو – چەند پێچەوانەی دوێنێ بوو کە سروشت، هەرچی، تاوتین و توانای خۆی هەبوو – بێ باکانە – بەسەردا هەڵڕشتین.

تیشکی زێڕینی خۆر لا پاڵی گردەکانی تەنیشتمانەوەی داگرتەوە، ئاوڕم دایەوە، شاخەکەی دوێنم دی، چ دیمەنێکی هەست فڕێن و ناخ بزوێن و چ تابلۆیەکی بەسام و بەهەیبەت بوو، بەفری سەر لووتکە بەرزەکان، وەك ئاوێنە، شەوقیان دەدایەوە و ئاوی چاویان دەبرد.

چەند ماڵێك هاتە سەر ڕێمان، لامان نەدا، ئەویش هەر لەسەر بڕیاری «م» بوو کە بەدەم ڕێگەوە دەیوت:

– چاکتر وایە کەمترین کەس، لەم ناوچەی سەر سنووورەدا بمانبینێت...

دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە تاقە ماڵێك، «م» وتی:

– لێرە، لەم ماڵە چاوەڕێم بکە. من تا دێی «گارێ» دەچم. زۆری لەسەر نەڕۆیشت، لە ماڵەکە دایمەزراندم، خاوەن ماڵ لەوێ نەبوو، بۆیە «م» بەکەیبانووی ماڵەکەی وت:

میوان ڕادەگرن.

دیار بوو ناسیاوی بوو، چونکە زۆر دۆستانە بەرەو پیرمانەوە هات و وتی:

– کەرەم کەن، ماڵی خۆتانە.

«م» لەگەڵ ژنەکەدا کەمێ چرپەی کرد و پاشان ڕوخسەتی خواست.

خۆم کرد بەژووردا، ماڵەکە یەکجار هەژار دەهاتە بەرچاو، لەسەر لبادێك دانیشتم، لای خوارووەوە پارچە بەرەیەکی شڕەڵەی، کون کون، ڕاخرابوو کە بەئەزیەت لەگەڵ زەوییەکەدا جیا دەکرایەوە.

کەیبانوو کەوتە گەرم کردنی زۆپاکە و منیش شانم دایە سەر سەرینێك و ئانیشکم لێ دادا، هەستم دایەوە گەشتەکەمان و ئەو دەردیسەریانەی تا ئەو کاتە هاتبووە ڕێگەمان، قسەکانی دوێنێ شەوی ئاوایی «گەلیشمم» دەهاتەوە یاد کە دەیانوت: چۆن توانیوتانە ئەو شاخە ببڕن.

ژنەکە چایەکی نایە بەردەمم، سەرنجی ژوورەکەم دا، بنمیچەکەی بەدووکەڵ ڕەش دا گەڕابوو، دەستێك نوێن لەسەر سندوقێکی کۆن هەڵچنرابوو، بەجاجمێك. کە لەوە دەچوو زۆر لە کۆنەوە نەشورابێت، نیوەی داپۆشرابوو، چەند کوولەکەیەك، بەدیوارەکەی بەرامبەرمەوە ئاوێزان بوو. ئایەتێکی قورئانیش کە لەبەر شڕی و کۆنیی، نەدەخوێندرایەوە لە ژێریەوە، بەبزمار، چەسپێندرابوو. بەدەم چا خواردنەکەوە ویستم بابەتی دەمە

تەقێیەك دابمەزرێنم، بەڵام هیچی وام بەخەیاڵدا نەدەهات، بۆیە زیاتر خۆم سەرقالی چا خواردنەوەکەم کرد، کە ژنەکە بێ ئەوەی سەیرم بکات وتی:

– خەڵکی کێ دەری ؟

زۆر خۆشحاڵ بووم کە پەردەی بێدەنگی دڕێندرا، وتم: خوشکێ... من خەڵکی ئەودیوم!

بەئاوازێکی سەرسووڕماوییەوە، بێ ئەوەی سەر بەرز بکاتەوە وتی:

– کام دیو... برا؟

ڕاستی دەکرد، ئەو شوێنەی لێی بووین نزیك هەردوو سنووری عێراق و ئێران بوو، بۆیە وەك ڕوونکردنەوەیەك – زیاتر بۆ داپۆشینی نەشارەزاییم – وتم:

– خوشکم... دیوی عێراق.

ئیتر ژنەکە قروقە پێ لێ کرد و هیچ لەسەری نەڕۆیشت، پیاڵە و قۆرییەکەی گرد کردەوە و لە چاو ون بوو.

جارێکی تر کەوتمەوە بیرکردنەوە، ئەمجارەیان بیرم لە ڕێگەکەی بەردەممان دەکردەوە. ڕێی زەحمەت – لای من – تەنیا گەیشتن بوو بە«شەمزینان»، چونکە لەوەو دوا، بۆ شارە گەورەکان، ڕێگەی ئۆتۆمبێل هەبوو.

ئەوەندەی نەبرد ژنی ماڵەکە هاتە ژوورێ، سینەیەکی بەدەستەوە بوو لەگەڵ بڕێ نان و دەورییەك هێلکە و ڕۆن.

زۆر سوپاسی ژنەکەم کرد، زۆریشم برسی بوو، بۆیە بێ سێ و دوو تێی نیشتم.

دەستم لە خواردنە کەدابوو کە «م» خۆی کرد بەژووردا، ئەمجارەیان تەواو خۆی گۆڕی بوو، خەریك بوو، نەیناسمەوە، جلە کوردییەکانی لەبەردا

نەبوو، لەباتی قەمسەڵە و پانتۆلێکی پۆشیبوو، کاسکێتیکێ ئینگلیزی چرچ و لۆچی لە سەر نابوو. زۆر بەسەرسوورمانەوە، تیم دەڕوانی بۆیە وتی:

– چییە؟ سەیری جلەکانم دەکەیت؟ کەمێك ڕاوەستا و دەستی بۆ کاسکێتەکەی سەری ڕاکێشا و وتی:

– لێرە بەدواوە جلی کوردی ناخوات دەبێ جلی ڕەسمی بپۆشین.

«م» ڕاستی دەکرد، هەموو کەسێك لە تورکیا – بەپێی فەرمانی ئەتاتورك – دەبووایە چاکەت و پانتۆڵی بپۆشیبایە. لای ئەتاتورك وابوو کە جل گۆڕین دەتوانێت وڵات پێش بخات و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش بگۆڕێت و بەرەو ئاستێکی دی بەرێت!

هەرچەندە بەنیسبەت کوردستانەوە، مەبەست پێشکەوتن و گۆڕینی پەیوەندییەکان نەبوو، بەڵکو مەبەست تەنیا نیشاندانی ڕەگەز پەرستی شۆڤینیەتی خۆی بوو، گەر نا، ناچار کردنی دێهاتی و شوان گاوان، لەو ناوچە سەخت و دوور دەستانەدا، بۆ پۆشینی «چاکەت و پانتۆڵ»، تەنیا لە گاڵتە و مەسخەرە پێ کردن، زیاتر هیچی تر نەبوو. دیمەنێکی تەواو نەگونجاو دڵتەزێن بوو، کاتێك کە پیاو، شوانێکی نەخوێندەواری قوڕبەسەری بەچاکەت و پانتۆڵێکی، هەمە ڕەنگی، شڕەوە دەبینی، هەر کسپە لە جەرگییەوە دەهات.

لەگەڵ «م» دا کەوتینە ڕێ، هەستم کرد کە تەواو لاڕێی دەگریت، بۆیە وتم:

– ئەم ناوە هیچ مەترسیی هەیە؟؟

بێ ئەوەی ناوڕم لێ بداتەوە وتی:

– ئەی چۆن، ئەم ناوە پڕە لە قەرەقوول(*)

(*) مەخفەری جەندرمە.

سەیری کردم، زەردەخەنەیەك گرتی و وتی:

– بەشوێنێکدا دەڕۆین کە تووشیان نەبین...

«م» دەیویست لە پێشدا بمبات بۆ دێیەکەی خۆیان و لەوێ جلەکانم پێ بگۆڕێ. ئەوەی باش بوو برادەرێکی خۆم، کە لەو ڕێگەیەوە گەڕابووەوە بۆ کوردستان، جلەکانی خۆی لەوێ بەجێ هێشتبوو.

دەمەو ئێوارێ گەیشتینە دێی «گارێ»، باوکی «م» پێشوازییەکی گەرمی کردین، خواردنێکی سەرپێیمان خوارد و پاشان خۆم گۆڕی. «م» سەرنجی دایە جلەکانم وتی:

– ئێستا کەس نازانێت کە لەو شاخ و داخەوە هاتوویت...

لە ماڵەکە دەرپەڕین، تاریکی باڵی کێشا بوو بەسەر دێدا، خەڵکی زۆر بەدەرەوە نەبوون ئوتومبێلێك لەسەر سووچی ماڵەکە ڕاگیرا بوو «م» چرپاندی بەگوێمدا:

– بەرەو شەمزینان دەمانبات...

ئوتومبێلەکە ڕێی شەمزینانی گرتە بەر. ماوەیەك بوو بەڕێوە بووین. «م» بەئەسپایی پێی وتم:

– پێش شەمزینان دادەبەزین. کۆنترۆڵی سەربازی هەیە... لە لۆفەکانی پێش شەمزینان دابەزین، بەلای ڕاستدا لامان دا و چەند گردۆڵکەیەکمان بڕی. تاریکی هەڵگەڕانی بەسەرگردەکاندا سەخت کردبوو، بەڵام شارەزایی «م» لەو شەوە ئەنگوستە چاوەدا سەرسوورهێنەر بوو. بەسەر گردێکدا سەرکەوتین و کاتێ داگەڕاین گڵۆپەکانی «شەمزینان» لە بەردەمماندا بوو، «شەمزینان» ئەوەندە گەورە نەبوو وەك بەخەیاڵمدا دەهات، شارۆچکەیەکی خنجیلانە کە کەوتبووە نێوەند کۆمەڵی شاخی سەختی ڕووتەوە کە بەفر لووتکەکانی ڕۆژهەڵاتی داپۆشیبوو. وردە وردە سەر بەرەو خوار ڕێمان کرد

تا گەیشتینە گەڕەکەکانی ڕۆژهەڵاتی شار، ئەوسا بەئاشکرا سەربازگەیەکی یەکجار گەورەم بەدی کرد، قوللەی پاسەوانی دەوری سەربازگەکە بەئاشکرا دەبینرا، پرۆژێکتەرە بەهێزەکان سەرانسەری دەوری شارەکەی ڕۆشن کردبووەوە.

«م» لێم نزیك کەوتەوە و ئانشکێکی تێوەژاندم.

– بەزووترین کات دەبێ لە بەرچاو ڕۆشنیاییی پرۆژێکتەرەکان ون بین دەنا تەقەمان لێ دەکەن...

هەنگاوەکانمان گورج تر کرد و خۆمان خزانە نێو یەکەمین کۆڵانەوە، چرای ئەلەکتریکی کۆڵانەکان کزکز دەسووتان، کەس بەدەرەوە نەبوو، هیچ جموجۆڵێکیش لەو ناوە دا بەدی نە دەکرا. لەوە دەچوو سەرما تێکڕای خەڵکی شارەکەی خزاندبێتە ژوورەوە، چونکە تەنانەت ورتەیەکیش نەدەبیسترا.

بەچەند کۆڵانێکی پێچاوپێچی پڕ لە قوڕ و لیتەدا، بێدەنگ دەڕۆیشتن کە «م» لە ناکاوێکدا لە بەردەم خانوویەکدا ڕاوەستا. سەیرێکی ئەملا و ئەولای خۆی کرد و وتی:

– ئەم سەرما و سۆڵەیە بۆ ئێمە گەلێك لەبار بوو. سەیر، لە سایەی خواوە کەس نەیدین.

لە دەرگای ماڵەکەی دا، کاتێك دەرگا کرایەوە، لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا، کە درزێکی کردبووە نێو دەرگاکەوە، چەند وشەیەکی بەتورکی گۆڕییەوە، کە من هەر هیچی تێ نەگەیشتم. چووینە ژوورەوە، ماڵەکە پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردین، ئەگەرچی من تاکە وشەیەکیش لە تورکی حاڵی نە دەبووم، لەگەڵ ئەوەشدا، هەستم کرد کە ماڵەکە تەواو میوان دۆست بوون.

«م» هەر زوو تێی گەیاندن کە من لە تورکی ناگەم، بۆیە لەگەڵ مندا

بەکرمانجی دەدوان، کەچی لە ناو خۆیاندا هەر بەتورکی بەردەوام بوون،

ئەو شەوە لەو ماڵە ماینەوە، «م» هەر لەگەڵ کوڕی خاوەن ماڵەکەدا سەرگەرمی دەمەتەقێ بوو، جارویار هەندێك لە قسەکانیان بۆ تەرجوومە دەکردم. ئەوەندەی من حاڵی بووم، کوڕی خاوەن ماڵەکە دەیویست بەیانی ئوتومبێلێکمان بۆ پەیدا بکات و بەرەو شاری «گەڤەر» ڕەوانەمان بکات.

کوڕی خاوەن ماڵەکە گەنجێکی(٢٠) ساڵان دەبوو. ڕووی تێ کردم و وتی:

– تازە ئەمشەو هیچ. بەم پەلە پەلە هیچ پەیدا نابێت، سبەینێ هەوڵ دەدەین ئوتومبێلێك پەیدا بکەین.

سەیرێکی «م»ی کرد و پاشان بەردەوام بوو.

– زۆر حەز دەکەم چەند ڕۆژێك لامان بمێننەوە و هەندێ لە هاوڕێیانمان ببینن، چونکە لام وایە، ئەوانیش تامەزرۆی دەنگوباسی شۆڕشی نوێی کوردستانی عێراقن؟.

بەلاچاو سەیری «م»م کرد، ئەو پشتی لە گڵۆپی ژوورەکە بوو، بۆیە هیچ جووڵەیەکم لە سەروچاویدا، کە ڕەنگدانەوەی. ئەرێ یا نەرێ بێ بەدی نەکرد.

خۆشحاڵیی خۆم بۆ پێشنیارەکەی نیشان دا و وتم:

– من هیچ پەلەم نییە و تەواو ئامادەم، کەی دەخوازن، باسی شۆڕش و کوردستانی ئەودیوتان بۆ بکەم، دەیکەم.

کوڕی خاوەن ماڵەکە گەشکە گرتی و وتی:

– سبەینێ دوو هاوڕێ دێنە لاتان.

سەری ڕەزامەندیم بۆ لەقاند. ئەو شەوە تۆزێ باسی لای خۆمانم بۆ کرد

و هاوکات سەرسوورمانی خۆشم لە تورکی ئاخاوتنی نێو ماڵیان نیشان دا.

کوڕەکە پشتگیری بۆ چوونەکانی منی کرد و وتی:

– هاوڕێ، تۆ نازانیت چەند دڕەندەن لەسەر بچووکترین شت بیانوو بەپیاو دەگرن.

کەمێك ڕاوەستا و پاشان هەستایە سەر پێ و پەردەی سەر پەنجەرەی ژوورەکەی هێنایەوە یەك و بەردەوام بوو.

– بەتایبەتی بەدانیشتووانی «شەمزینان». ڕەنگە خۆت هەرزوو هەستت بەو سەربازگە گەورەیە کردبێت، کە خۆی بەتەنیا لە نیوەی شارەکەمان گەورەترە، زێدە ڕۆیی ناکەم، گەر بێتو، بڵێم ژمارەی سەرباز و کارمەندانی سەربازگەکە و سیخور و چڵکا و خۆرانیان، ڕەنگە، لە ژمارەی دانیشتووانی «شەمزینان» زیاتر بن.

خۆشم هەستم بەو ڕاستییە کردبوو کە سەربازگەکەی «شەمزینان» یەکجار گەورە بوو. ڕژێمی تورکیش، وەك داگیرکەر، لەگەڵ خەڵکی کوردستاندا ڕەفتاری دەکرد، گەر نا ئەو هەموو سەربازگە و قەرەقوول و ژاندرمە و ڕەبیە چی بوون، کە لەو ناوچە شاخاوی و دوور دەستانەدا، قوتی کردبوونەوە.

زۆری ترمان قسەکرد تا باویشکە یەك لە دوای یەکەکانی «م» بەئاگای هێناینەوە و کاتی نووستنی بیرخستینەوە.

بەیانی دوای بەرچایی، دوو هاوڕێی ڕێکخراوی «کاوە» هاتنە لام. دەربارەی وەزعی خۆیان گەلێك دوان، سەبارەت دۆخی ناهەمواری کوردستان زۆر ڕاستییان خستە پێش چاوم. ئەگەرچی ڕژێمی «ئیجاڤید»، دەسەڵاتی سیاسی لە «ئەنقەرە» دەبرد بەڕێوە و لە بەرچاوی جیهان،

بەتایبەتی ڕۆژئاوا، دەمی لە دیموکراسی و سۆسیالیزم و خۆشگوزەرانییەوە دەکوتا، کەچی لە ناوچە کوردییەکاندا، دەسەڵات هەر بەدەست عەسکەرەوە بوو. هیچ نیشانەیەکی دیموکراتی و ڕژێمی مەدەنی لەو ناوچانەدا، بەدی نەدەکران و کوردستانیشیان نوقمی داوکەوتوویی کرد بوو. دیارە هەر ئەوەش وای لە ڕێکخراوە کوردییەکانی نێو تورکیا کردبوو کە خەباتیان نهێنی و چالاکی سیاسییان ژێرزەمینی بێت.

دەربارەی کوردستانی عێراق پرسیاری زۆریان کرد، ئەوەی بەلای ئەوانەوە گەلێ سەرسووڕهێنەر بوو، ئەوە بوو کە چۆن ئێمەی کوردی عێراق دوای تێکشکانە گەورەیە، توانیومانە جارێکی تر، دەست بدەینەوە چەك و سەر لە نوێ خەباتی چەکداری بەرپا بکەینەوە.

دەمەو نیوەڕۆ جێیان هێشتین و لە خواحافیزیدا وتیان:

– ئێوارێ دوو برادەری تر دێن و مەسەلەی ڕەوانە کردنیان بۆ شاری «گەڤەر» ڕێك دەخەن.

ئەو پاش نیوەڕۆیە لەگەڵ کوڕی خاوەن ماڵەکە و «م»دا کەوتینە وتووێژ. من باری سەرنجی خۆم دەربارەی دیاردەی زێدە چەپڕەویی زۆر لە ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردستانی تورکیا نیشان دا. کوڕی خاوەن ماڵەکە دەیویست پاساوێك بۆ ئەو بان – چەپییەی نێو خۆیان بدۆزێتەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، وەڵامەکانی و ڕەتکردنەوەکانی، بێ ئەزموونی و ئاستی سیاسیی تەنکی – بەڵام دڵسۆزی– دەنواند.

ڕژێمی تورکیا بەو سیاسەتە سەرکوتکەرانەی کە لە ماوەی زیاد لە نیو سەدە پەیڕەوی دەکرد، وای لە خەڵکەکە و ڕێکخراوە کوردییەکان کردبوو، کە ئەوانیش، داواکانیان و ئامانجی ڕێکخستنەکانیان دوور لە واقیع دابڕێژن.

خەباتیان زیاتر لە کاردانەوەیەکی دژ بەزوڵم و زۆر دەچوو، وەك، لەوەی پڕۆگرامێکی سیاسیی گونجاو بێت کە داهاتوویەکی ڕۆشن بۆ گەلەکەیان

دەستەبەر بکات، چونکە زۆربەی ڕێکخراوەکان ئەگەرچی تورکیا ئەندامێکی گرنگ و چالاکی ناتۆش بوو، زۆر دژ بەسۆڤیەت بوون، ئەوا دەیانویست سۆسیالیزمێکی نوێ، لە جێی ئەو سۆسیالیزمە، لە وڵاتێکی ژێر دەستی وەکو کوردستانی تورکیا دابمەزرێنن!!

دەمەو ئێوارە لە دەرگا درا، بەنیگەرانییەوە سەیری یەکترمان کرد، کوڕی خاوەن ماڵەکە ڕاپەڕی و درزێکی خستە پەردەی سەر پەنجەرەکە و پاش ساتێ ئاوڕی لێ داینەوە و بەزەردەخەنەیەکەوە کە نوقمی سەرکەوتن بوو وتی:

– برادەرانن!

گورج خۆمان گرد کردەوە و لە بەردەم دەرگای دەرەوەدا، کوڕی خاوەن ماڵەکە، خواحافیزییەکی گەرموگوڕی لێ کردین و داوای سەرکەوتنی بۆ کردین و ئێمەش دوای ئەو دوو برادەرە کەوتین. ئەوەی لە سەرەتا دا سەرنجی ڕاکێشام سیمای سەیر و سەرسووڕهێنەری ئەو دوو برادەرە بوو. یەکێکیان سەری پاك تاشی بوو، بەڵام بەپێچەوانەوە ڕیشێکی درێژی هێشتبووەوە، ئەوی تریان سمێڵی تاشی بوو، چەند خاڵێکی دەستکردی لەسەر ڕوومەتەکانی وەك ئەکتەرێکی سەرنەکەوتوو نەخشاندبوو، سەرەڕای ئەوەش چاویلکەیەکی ڕەشی لە چاو دابوو ئەگەرچی ڕۆژ بەرەو ڕۆژئاوابوونیش دەچوو.

لەوە دەچوو ئەو خۆ گۆڕینەیان، بەو شێوە زەقە، کە مرۆڤی نەشارەزاش هەستی پێ دەکرد، بۆ ئەوە بوو بێت، کە بەو کارەیان هەڵدەستن – ئەویش پەیدا کردنی ئوتومبێلە – نەناسرێنەوە!

ئەوان یەك بەدوای یەکدا و ئێمەش بەدوایاندا، دەڕۆیشتین سەر سافەکەیان خێرا خێرا ئاوڕی لێ دەدایەوە و هەڵوێستەیەکی دەکرد و بەسەری پەنجە ئاماژەی بۆ برادەرەکەی دەکرد و ئەویش بەدەوری خۆی، بەشێوەیەکی

میکانیکی، دەقاودەق ڕەفتاری دەکرد. ئەوان مەسەلەکەیان زۆر بەگەورە گرتبوو، هەڵسوکەوتیان پیاوی دەخستە پێکەنین و منیشی تەواو دڵخورت دەکرد، بۆیە زیاتر خۆم لە «م» نزیك کردەوە و بەچرپە پێم گوت:

– گەر ئەمانە ئەوا ڕێنماییمان بکەن، بێگومانم تووشی بەڵایەکمان دەکەن.

ئەو جۆرە ڕەفتارەی ئەوان، هەر دەبووە مایەی سەرنجڕاکێشانی خەڵکی، بەڵام سوپاس بۆ خوا، کۆڵانەکان ئەو سەر لە ئێوارەیە هێندە خەڵکی پێوە نەبوون. تەنیا یەك دوو کەسمان هاتە ڕێ، ئەوانیش لەبەر سەرما، کاسکیتەکانیان تا سەرچاویان ڕاکێشابوو، ملیان کوڕ کردبوو و مل پێچەکانیان لە دەمولووتیانەوە ئاڵاندبوو، بەلاماندا تێ دەپەڕین – وەك هەر هەستیان بەبوونیشمان نەکرد بێت – تارماییی ئاسا لە بەرچاو غەیب دەبوون. کاتێك گەیشتینەماڵەکانی ڕۆژئاوای «شەمزینان»، دەوروبەر تەواو تاریکی کردبوو، لە پەنا کەلاوەیەکدا، ڕێنمایی کەرانمان ڕایان گرتین و خۆیان لە چاو ترووکانێکدا، تاریکی قوتی دان.

لە پەنا دیواری ڕووخاوی کەلاوەکەدا هەڵترووشکام «م» هەر بەپێوە بوو. سەرنجی ئەملاو ئەولای دەدا. لێم پرسی:

– چ پێویست بەم دوو برادەرە بوو، مەگەر خۆت خەڵکی ئەم ناوچەیە نیت؟.

سەری ڕەزامەندیی لەقاند و لە ژێر لێوەوە وتی:

– با چۆن نا، بەڵام ئەوان خۆیان حەز دەکەن... حەز دەکەن خزمەتێکت بکەن!

هیچ لەسەری نەڕۆیشتم، هەردووك بێ ورتە چاوەڕوان بووین، شوێنەکەمان مەترسیدار بوو، چونکە هەرکەسێك لەوێدا بەدی بکردینایە

گومانی لێ دەکردین، لەوە دەچوو خۆمان حەشار دابێت و لە بوسەدابین، بەڵام تازە... تازە ناچار بووین.

ماوەیەك، بە بێدەنگی، لەو شوێنەدا بووین، کاتێك گوێمان لە دەنگی ئوتومبێلێك بوو، کە لێمان نزیك دەکەوتەوە، کە ڕاوەستا، یەکێك لە برادەرەکان بەهەڵە داوان بەپیرمانەوە هات و بەهەناسە بڕکێوە پێی وتین:

ئۆتۆمبیل... ئۆتۆمبیل... ئامادەیە.

کە لە کەلاوەکە هاتینە دەرەوە و بەدەوروپشتی خۆمدا ڕوانیم، هەر بڕوام نەکرد. گەڵابەیەك وەستابوو، چەند کرێکارێك لە پشتی گەلابەکەدا بەپێوە ڕاوەستا بوون.

بەسەرسووڕمانەوە بەبرادەرەکەم وت:

ئا ئەمەیە... ئۆتۆمبیلەکە!؟

ئەو هیچ ورتەی نەکرد، هەر بەدەست ئاماژەی بۆ ئۆتۆمبیلەکە دەکرد. بەدەنگێکی لەرزۆرکەوە وتی:

بەڵێ... بەڵێ... هەڤالان... بەپەلە سوار بن تا کەس نەیدیون!

زۆر شلەژابوو، دەنگی لەرزۆك و گیربووی ڕادەی نیگەرانی و بێ سەبریی نیشان دەدا.

کە لە ئۆتۆمبێلەکە نزیك کەوتمەوە، بەبرادەرەکەی تریانم وت:

چۆن وا وا بەئاشکرا بڕۆین، نازانی ئێمە قاچاغین.

ئەویش ئەوەندە پەشوکابوو کە لەوە نە دەچوو هەر گوێشی لە قسەکانم بێت. هەر سەیری ئەملاولای خۆی دەکردو وەك فەرمانی سەربازی بدات وتی:

خێراکەن... درەنگە... سواربن... سواربن. کرێکاران و شوفێری گەلابەکە

بەسەرسامییەوە تییان دەڕوانین و لەم کەینوبەینە تێ نە دەگەیشتن...

لەوە زیاتر خۆمان دوا نەخست، دیار بوو، مشتومڕمان بێ سوود بوو، بەپشتی گەلابەکەدا هەلزناین و لە ناو کرێکارەکاندا ئێمەش بەپێوە وەستاین.

لە دڵی خۆمدا وتم:

– کاری نهێنی هەر وا دەبێت.

گەلابەکە کەوتە کار و برادەرەکانیش – وەك زەوی قوتی دابن – لە چرکەیەکەدا لە بەرچاو نەمان.

ئۆتۆمبیلەکە کەوتە رێ، لە ڕاستیدا ئەو هەڤالانە کارێکی زۆر سەرپێییان کرد و ئێمەشیان تووشی دۆخێکی زۆر نالەبار کرد، لە لایەك سەرمای پشتی گەلابەکە پیاوی دەتەزان و لە لایەکی تریشەوە سوار بوون بەو شێوەیە هیچ سەلیقەیەك و لێزانینێکی بەخۆیەوە نە دەنواند.

لە پشتی ئۆتۆمبێلەکەدا هەڵتەك هەڵتەکمان بوو، سەرنجم دایە کرێکارەکان، هەموو لە سەرما شین و ڕەش داگەڕا بوون، ڕیشیان هاتبوو، بەچاکەت و پانتۆلە کورت و کوێر و چڵکنەکانیانەوە ئاستی هەژاری و نەبوونیانی، بەزەقی، ڕادەگەیاند. یەکێکیان لێم هاتە پێشەوە و بەدەنگی بەرز وتی:

هاڤالۆ... خەڵکی کێ دەری؟

زۆر سەرم سووڕما، چۆن، بەچیدا، زانی خەڵکی لای ئەوان نیم، بەجلەکانمدا کە زۆر تازەبوون، بەسەروسیما و هەیئەتمدا یا بەسواربوونی نا بەدڵی پشتی گەلابەکەدا؟ نازانم، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەکورتی وتم:– ئەوديو... ئەوديو.

ئاوازی وەلامدانەوەکەم بەکورتی و بێ سەبری بوو، هیچ مۆڵەتی

پرسیاری تری نەدەدا، بۆیە کرێکارەکە بەسەرسامییەوە تێی ڕوانیم و پاشان ڕووی وەرگێڕا و هیچی تری نەگوت، منیش هەر بۆ ئەوەی نەکو پرسیاری ترم لێ بکا خۆم بەسەیری شاخەکەی ئەوبەرەمانەوە خافڵاند.

سەرما و بای توندی پشتی تومبێلەکە تینی بۆ هێنام، بۆیە بەچیچکانەوە دانیشتم و ویستم پاڵ بەدیواری گەلابەکەوە، بدەم کە «م» بەتوندی شانی ڕاوەشاندم و ئاگاداری کردمەوە کە ئەو کارە نەکەم. قەراغ و لێواری و زەمینی گەڵلابەکە یەکپارچە قور و لیتە بوو، بۆیە بەناچاری هەستامەوە سەرپێ و خۆم بەناڕەزایی دایەوە بەر تەوژمی هەوا ساردەکە.

شاخی ڕۆژئاوای شەمزینان سەراپای بەفر گرتبووی و تەنیا ڕێی ئۆتۆمبێلەکان ڕەش دەچووەوە و ئەویش تا زیاتر سەر دەکەوتین بەفر و بەستەڵەك دای دەگرتەوە.

دەستم – لە سەرما – خستبووە ناو گیرفانی پانتۆڵەکەم و دەمویست تەوازنی خۆم تاقی بکەمەوە کە لە ناکاودا ئوتومبێلەکە لە کار کەوت و لە جێی خۆی ڕاوەستا. شوفێرەکە هەرچی هەوڵی دا بیخاتەوە کار، بەڵام بێ سوود بوو.

لەگەڵ کرێکارەکاندا دابەزین و دەستەوەستان دەمانڕوانییە ئۆتۆمبێلەکە، شوفێرەکە داوای لێ کردین، کە بەهەموومان، پاڵ بنێین. هەوڵێکی بێ بەر بوو، ئوتومبێلەکە یەك بست لە جێی خۆی نەبزوا.

بێ هیوا و سەرزەنشتکەرانە دەمڕوانییە «م» ئەویش بێ ئومێدانە دەستی نابووە ژێر چەناگەی و لە نیگای چاوەکانم ڕای دەکرد.

کەس نەیدەزانی چی بکات، شوفێرەکە هەر بۆ دڵنەوایی ئێمە دابەزی و وتی:

– بەشکو ئەمە خوایە ئۆتۆمبێلێك پەیدا ببێت و بەرەو «گەڤەڕ» بتانبات.

چراکانی شەمزینان، لەو بەرزاییەوە، بەئاسانی، بەدی دەکران. چەند تویەڵە ڕۆشناییەك لە دۆڵەکەی خوارمانەوە، لێرە و لەوێ دەبینران، کرێکارەکان هەندێکیان لە نزیك ئۆتۆمبێلەکەوە هەڵترووشکا بوون، شوفێرەکەش هەر بۆ نیشاندانی هەستی بەتەنگەوە بوونی، بۆنیتی ئۆتۆمبێلەکەی هەڵدایەوە و سەری بەناو مەکینەکەدا شۆڕ کردەوە. «م» هەر بۆ ئەوەی لە پرسیار و تانووت و سەر کۆنەی من ڕزگاری بیت، چوبووە تەنیشت شوفێرەکەوە خۆی – لە هیچە – سەرقاڵ دەکرد.

سەرم هەڵبڕی، ڕۆشنایی چرای ئۆتۆمبێلێك، لە ژوورمانەوە، تیشکی بەسەرماندا دەپرژاند و لە ناو تەمی ئاسماندا بزر دەبوو.

چراکانی، جاروبار، لە پێچ و لۆفەی شاخەکەدا، دیار نەدەمان، وردە وردەش ورەی ئۆتۆمبیلەکە دەهاتە بەر گوێ و ترس و سامی ئەو بێ دەنگییەی نێوان خۆمانی دەرەوانەوە و هیوای نوێی دەخستە دڵمانەوە، کە هەرنەبێ، لەسەر ئەم شاخە، بەجێ نامێنین و ڕەق هەڵنایەین. لە دڵی خۆمدا وتم:

«هەرنەبێ دەمانگێڕێتەوە بۆ شەمزینان»

«م» بەخۆشحاڵییەوە هاتە لامەوە وتی:

«خوامان لە پشتە»!

هیچ وەڵامم نەدایەوە، لە ڕاستیدا پەست بووم لێی

ئۆتۆمبێلەکە لە ماوەیەکی کورتدا گەیشتە لامان. جێبێکی کورت بوو. تەنیا شوفێرێکی تێدا بوو. جێبەکە وەستا و شوفێرەکە هاتە خوارێ و یەکسەر کەوتە هەواڵ پرسینی شوفێرەکەمان، دیار بوو ئاشنای یەکتری بوون. برێ قسەیان پێکەوە، بەتورکی، کرد و چەند جارێك ئاماژەیان بۆ سەر لووتکەی شاخەکە کرد.

بەپەلە بە«م»م وت:

«فریابکەوە و بەشکو ئەم شوفێرە ڕازی بکەیت کە تا «گەڤەڕ»مان بەرێت؟»

«م» خەریك بوو قسە بکات کە یەکسەر پێم وت:

«چەندیش داوا دەکات دەیدەینێ...»

«م» هەروەك چاوەڕێی ئەو فەرمانە بوو بێ، ڕاستەوخۆ چووە لای شوفێرەکە و لەگەڵی کەوتە دەمەتەقێ. کابرای شوفێر ئیشارەتی بۆلای خوارەوەمانەوە، کە شەمزینان بوو، دەکرد و «م»یش ئاماژەی بۆ لای، سەروو دەکرد کە ڕێگای «گەڤەڕ» بوو جێبەکە ڕووی بەرەو گەڤەڕ وەرگێڕا، (م) تەواو بەخۆشحاڵییەوە کە سەرکەوتنی لێ دەتکا.

وتی:

«هەرچۆنێك بێت قەناعەتم پێ کرد فەرموو با سواربین...»

کرێکارەکان بەچاوی گومانەوە تێیان دەڕوانین. یەکێکیان کە لە هەموویان زیاتر شین هەڵگەڕابوو، سەرێکی ناڕەزاییی لەقاند و لەبەر خۆیەوە هەندێ پرتە و بۆڵەی کرد. گومانم لەوەدا نییە کە جنێوی دابێ یا، بەلای کەمەوە، وتبێتی:

«ئەو پۆشتە و پەرداخانە لە هەموو شوێنێك هەر جێمان دێڵن»

جێبەکە سەرەو ژوور کەوتە ڕێ. من لە نێوان شوفێرەکە و «م»دا، دانیشتبووم. بەکوردی بەشوفێرەکەم وت:

«ماوەی نێوان «شەمزینان» و «گەڤەڕ» چەند دەبێت؟»

شوفێرەکە بەسەرسوڕمانەوە سەیری کردم و وتی:

«هەر سەد کیلۆمەترێك دەبێت»

منیش هەر بۆ دروست کردنی بابەتێکی وتووێژ وتم:

«یانی یەك کاتژمێر»

شوفێرەکە، بێ ئەوەی سەیرم بکات، زۆر بەکورتی، کەلەوە دەچوو نەیەوێت زیاتر لەسەری بڕۆین وتی:

«نەخێر، سێ کاتژمێر»

نەمکردە مشتومڕ لەگەڵیدا، ئەو خۆی شارەزا بوو. ئەو ڕێگە سەختە، بەشەو، بەناوەڕاستی زستان و بەویەفرە خەستە، گومانی لە وتەکانی شوفێر دەبڕی. ئەو حساباتەی من بۆ جادەیەکی قیرتاوی تەخت و لە ناوەڕاستی هاویندا دەگونجا، نە بۆ ئەمَ شاخ و داخە ڕژد و دوور دەستە.

بەلاچاو سەیری شوفێرەکەم کرد، ولاّخدارەکەی ڕێی (سەردەشت)م بیرکەوتەوە کە دەیوت؛ (بەشەو، لە ڕێگە ڕۆشتندا، قسە جایز نییە بۆ ڕێبوار). سەروپۆتەلاکی توند و هیلاکی ئەمیش هەر ئەو ڕاستییەی دەدرکاند.

قاچاغچی بەولاّخ بێت یا بەئۆتۆمبیل هەرهەمان ڕەفتار دەنوێنێ.

جێبەکە گەیشتە سەر لووتکەی شاخەکە و لە داگەڕانیدا وام دەزانی بەرەو تەختایی دەڕۆین کەچی بەپێچەوانەی بۆچوونمەوە، تا چاو بڕی دەکرد هەر شاخ و هەڵەت و گرد و ڕەقەنی بوو. لە دڵی خۆمدا وتم:

"لەوە ناچێت لەم سەرزەمینە تەختایی هەبێت"

شەش مانگ لەوەوبەر، کاتێك لەگەڵ سەدان چەکدار و بێ چەکدا، بۆ هێرش بردنە سەر (ق.م)یخ درابووین و ئەو ناوچانەمان تەی دەکرد دەموت ڕەنگ بێ ئەو ناوچانە هەمووی وا سەخت و تەلان نەبن، بەلاّم دیارە. بەهەڵەدا چووبووم چونکە ئەم ناوچەیەی کوردستانی ژووروو هەر هەمووی شاخ و کێو و سەختی بوو. تەنیا ڕێگایەك کە دەهاتە پێش چاو، لەم ناوچە شاخاوییە دا هەر ئەم جادەیە خۆمان بوو، کە ئەویش قیرتاو نەبوو.

هەرسێکمان بێدەنگ بووین، شوفێرەکە وەك هەستی بەبێ تاقەتیم کردبێ سویچی ڕادیۆکەی کردەوە و کەوتە بادانی میلەکەی کە لەبەر خشەخش و زیکە و فیکەی تێکەڵبوونی ئێستگەکان، بەتووڕەییەوە یەکسەر دای خست.

بەچرپە بە«م» وت:

«هیچ بازگە لەسەر ئەم ڕێگایە هەیە؟»

ئەویش بەدەوری خۆی ئەو پرسیارەی لە شوفێرەکە کرد کە لە وەڵامدا بەکوردی وتی:

«قەرەقووڵ هەیە، ئەوان کاریان بەسەر موسافیرەوە نییە!»

زۆرم دەربارەی ئەو قەرەقوولانە بیستوو کە چۆن لە ناوچە کوردییەکاندا ئازار و ئەشکەنجەی خەڵکی بێ تاوان و هەژاران دەدەن و چۆن بەسووکی ڕەفتار لەگەڵ گوند نشینەکان دەکەن و چۆن ئاغاکانی ئەو ناوچانەش چاوترسێنی جووتیاران بەو قەرەقوولانە دەکەن.

ئوتومبێلەکە هەر دادمگەڕا، کاتێك گەیشتە بناری شاخەکە، شوفێرەکەمان بێ ئەوەی سەیرمان بکات، ئیشارەتی بۆ لای ئێمە کردوو وتی:

"لەو بەرتانەوە قەرەقوولێك هەیە"

هیچی تری نەوت و لەسەر لێخووڕین بەردەوام بوو، لە ڕاستیدا من هیچم لێ بەدی نەکرد، هەرچەند ملم بۆلای پەنجەرەکەی «م» وەرچەرخاند، بەڵام لە تاریکیی بناری شاخەکە زیاتر هیچی ترم نەدی، خەریك بوو پرسیار لە «م» بکەم کە سیخورمەیەکی توندی تێوە شاندم. سێ ژەندرمە لەسەر جادەکە ڕاوەستابوون و بەدەستیان ئیشارەتی ڕاوەستانیان دەکرد. ئوتومبێلەکەمان وەستا. من دڵم تەواو داخورپا. شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. ئەمانە لە کوێوە پەیدابوون.

ژندرمەکان هاتنە لای شوفێرەکە و بەتورکی کەوتنە ئاخاوتن، من فزەم لە خۆم بڕی بوو بەلاچاو سەیری «م»م دەکرد ئەویش تەواو ڕەنگی پەڕیبوو، ژەندرمەکان لەگەڵ شوفێرەکە بەردەوام بوون، بەڵام هیچیان لەگەڵ ئێمە نەوت بۆیە منیش زاتم دایە خۆم بەئەسپایی لە «م» پرسی:

«ئەمانە چییان دەوێت؟»

«م» هیچ خۆی تێك نەدا، لە ژێر لێوەوە وتی:

«ئەمانە دەڵێن ئەستێرە بەشانەکەیان تا سەربازگەیەکی نزیك لەگەڵمان دێ!»

ئەستێرەبەشان، مەبەستی، ئەفسەر بوو. یەکێك لە ژەندرمەکان ئوتومبێلەکەی بەجێ هێشت و دوانیشیان بەدیارمانەوە مانەوە. هەر دەمە تەقەیان بوو.

پاش چەند دەقیقەیەك ئەفسەرەکە هات و یەکسەر لای «م»ەوە سوار بوو هەندێ قسەی کرد، دیار بوو سڵاو بوو من هەر بێ ورتە بووم و دەستە سڕێکم خستبووە سەر لا شەویلگەی ڕاستم و، بە«م» پێش گەیشتنی ئەفسەرەکە وتبوو؛ گەر قسەیان لەگەڵدا کردم من وەڵام نادەمەوە و گوایە تووشی دان ئێشەیەکی یەکجار سەخت بووم و بۆ گەڤەرم دەبەن.

ئۆتۆمبێلەکە کەوتەوە ڕێ، هەموو بێدەنگ بووین و منیش بەشێوەیەك دانیشتبووم کە ئەفسەرەکە نەیدەتوانی بەئاسانی، بمبینێ. پاش ساتێك ئەفسەرەکە لەگەڵ «م» کەوتە دەمەتەقێ. نەمدەزانی باسی چی دەکەن. دڵم هەزاران خەتورەی جۆراوجۆری دەکرد، تۆ بڵێی باسی من نەکەن، لە سەرکەوتنی ئەفسەرەکەدا تۆ بڵێی جلەکانم -کەبڕێك تازەبوون- سەرنجیان ڕانەکێشا بێ یا گەر پرسیارێکی لێ کردم وەڵامم چی بێ؟

شوفێرەکە لەوە دەچوو هەستی بەناڕەحتیم کردبێ، چونکە چەند جارێك بەئەژنۆ لە «م»مەوە وەژاند و دەمویست تێی بگەیێنم کە بەجۆرێك دابنیشێ

که ئەفسەرەکە هەر ئەم بینێ، چونکە جاروبار «م» لە کاتی قسەکردنیدا بێ ئاگا پاڵی دەدایەوە و مۆڵەتی بینینمی بۆ ئەفسەرەکە دەرەخسان، کە خۆشبەختانە ئەو لای نەدەکردەوە و هەر سەیری جامی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەکەی دەکرد و زۆر بەوردی -کە رەنگە لە ترسان بووبێ- لە جادە قورینەکەی کە بەئاستەم بەتیشکی لاوازی لایتی ئۆتۆمبێلەکە روناك دەبووە و بەرزی و نزمیی دەردەکەت، سەرنجی دەدا.

شوفێرەکە، هەر بۆ دڵنەواییم، جارێکی تر رادیۆکەی کردەوە و کەوتە بادانی میلەکەی کە دوای خشەخشێکی زۆر، لەسەر گۆرانییەکی تورکی گیرسانیەوە.

دەنگی زولاڵ و بەسۆزی گۆرانیبێژەکە هەردوو ئەفسەر و «م»ی بێدەنگ کرد. شوفێرەکەش کە دیار بوو چەندان شەوانی دووروودرێژی لەم رێگە سەخت و هەڵەتە، بەئۆتۆمبێلەکەی تەی کردووە، کەوتە بادانی سەری، ئەگەرچی بزوانی سەری بەتەواوی لەگەڵ ئیقاعی مۆسیقاکەشدا نەدەگونجا، بەڵام ئەم سەری نەشئەت و خۆشیی هەر بادەدا.

رۆشناییەکی بەهێز لە ناکاودا تەواوی جادە و دەوروپشتمانی رۆشن کردەوە و پاش ساتێك شوفێرەکە راوەستا. چەند سەربازێك لێمان هاتنە پێشەوە و سەریان بۆ ناو ئوتومبێلەکە راکێشا و کاتێ ئەفسەرەکەیان دی یەکسەر قیت بوونەوە و پاشان هاتنە لای دەرگای ئەفسەرەکەوە، ئەفسەرەکەش برێ قسەی لەگەڵ شوفێر و «م»دا کرد و بێ ئەوەی هیچ پارەیەك بدات یەکسەر دابەزی.

سەربازەکان داری سەیتەرەکەیان بۆ بەرزکردینەوە و بێ ئەوەی هیچ پرسیارێکمان لێ بکەن مۆڵەتی رۆشتنیان داین.

هەر لە سەربازگەکە دوورکەوتینەوە «م» دەستێکی بەسەروچاویدا هێنا و بەدەنگێکی بەرز وتی:

«بەخوا چاك بوو لەم بەڵایە ڕزگارمان بوو»

شوفێرەکە دەنگی ڕادیۆکەی کزکرد. «م» ڕووی کردە من و بەردەوام بوو:

«باشە گەر پرسیارێکی لێت بکردایە وەڵامت چی دەبوو»

وەڵامم نەدایەوە و لە باتی ئانیشکێکم لە کەلەکەی داو ئیشارەتم بۆ دەستەسڕەکەی سەرشەویلگەم کرد بۆیە دایە قاقای پێکەنین و وتی:

«باشترین وەڵام».

ئوتومبێلەکە وردە وردە ڕووەو تەختایی ملی دەنا و تا دەهات ڕێگەکە ڕێك دەبووەوە، دەشتێکی پانوبەرین لە بەردەماندا دەرکەوت «م» وتی:

«ئەمەش دەشتی گەڤەرە، بەڵام هێشتا ماومانە»

(م) خۆی هێنایە پێش و پرسیاری لە شوفێرەکە کرد:

«بەچەندی تر دەگەینە گەڤەر» ؟

شوفێرەکە ئاوڕی لێمان دایەوە وتی:

«نیو سەعاتێکی تر – ئیشەڵڵا – دەگەین»

پاڵم تەواو دایەوە. چاوم نووقاند، لە ڕاستیدا هیلاك بووم و دەمویست گەر بۆ ساتێکی کورتیش بێ، سەرخەوێك بشکێنم.

بەپێی بڕیاری «م» دەبوو شەو لە «گەڤەر» لە ماڵی ناسیاوێکی بمێنینەوە، ڕۆژی داهاتوو بەرەو (دیاربەکر) مل بنێین.

نازانم چەند بوو چاوم لێك نابوو کە لەناکاودا «م» ئانیشکێکی توندی لێ دام و بەئاگای هێنامەوە. چاوم هەڵبڕی، ئۆتۆمبێلەکەمان بەتیژی بەناوەڕاست جادەکەدا دەڕۆیشت، ئەم لاولای جادەکە هەمووی بەفر بوو، هیچ خانوو یا ئاوەدانییەك لە کەناری جادەکە نەدەبینرا، بەڵام لە دوورەوە، هەر لەسەر جادەکە، لایتێکی سوور دادەگیرسا و دەکوژایەوە. دڵم داخورپا و بە«م» وت:

«ئەو لایتە سوورە چییە وا لە دوورەوە دادەگیرسێ و دەکوژێتەوە»؟

«م» سەری بادا و هەمان پرسیاری لە شوفێرەکە کرد. شوفێرەکەش بۆ دڵنیاییمان وتی:

«هیچ نییە. جاروبار مەفرەزەی گومرگ، لەسەر ئەم جادەیە، ڕادەوەستێ و بۆ ماڵی قاچاغ دەگەڕێ»

کەمێك ڕاوەستا و پاشان وتی:

«ئەوانە هەقیان بەسەر موسافیرەوە نییە و ئۆتۆمبێلی باریش نەبێ هەر ڕای ناگرن»

نیگەرانی تینی بۆ هێنام، چەند جارێك خەریك بوو بە«م» بڵێم با دابەزین و خۆمان دووچاری سودفە نەکەین، بەڵام شەرمم دەکرد و هەروەك نەشمدەویست ئەو هەست بەدڵخورتیم بکا، بۆیە منیش بێدەنگ بووم و بەگومانەوە سەیری دیمەنەکەی بەرامبەرم دەکرد.

تیشکی سووری لایتەکە تا دەهات ئاشکراتر دەبوو، گومانم تەواو لەوەبوو کە ئەمانە بۆ قاچاغ چی ڕاوەستابن. پیاو گەر بیەوێ قاچاغی بگرێ، بۆسەی بۆ دادەنێ، وا لە نێوەڕاستی شەقامدا بۆی ناوەستێ. ڕووم کردەوە «م» پێم وت:

«زۆر بەگومانم، لەم لایتە، با دابەزین»

«م» پەشۆکاو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا قیت دانیشتبوو. وتی:

«تازە ناکرێ، هەردوو لامان بەفر و چۆڵەوانییە و هیچ ئاوەدانییەکیش لەم نزیکانە نییە»

پاشانیش ڕووی تێ کردم، وتی:

«هەر ڕاشوەستین زیاتر سەرنجی ئەوانە ڕادەکێشین و ڕەنگە یەکسەر بێنە سەرمان»

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و پاڵی دایەوە وتی:

«لەسەر خوا»

پەساپۆرتێکی عێراقیی کۆن و هەندێ نامەی نهێنی لە گیرفانمدا بوون، نامەکان بۆ لێپرسراوانی بەرزی سووریا بوون و زانیاری مەترسیدارییان تێدابوو، بۆیە تەواو نا ئارام بووم، پەساپۆرت و نامەکانم دەرهێنا و بە«م» وت:

«چارەسەرێکی ئەم بەلایانەم بۆ بکە»

پەساپۆرت و نووسراوە چکلێتییەکانی لێ وەرگرتم و دایە دەست شوفێرەکە و پێی وت:

«لە شوێنێکی باشدا ئەمانەمان بۆ بشارەوە تا دەگەینە گەڤەر»

لبادێکی چڵکن کە بەسەر داشبوڵی ئۆتۆمبێلەکەیدا (لەبەر جوانی؟) ڕای خستبوو، هەڵدایەوە و زۆر بەهێمنی، پەساپۆرت و نامەکانی لە ژێردا دانا، زەردەخەنەیەکی سەرکەوتووانە گرتی و بەڵنیاییەوە دەستی دا بەسەر لبادەکەدا وتی:

«کەس گومان لەم شوێنە ناکات ...»

هەر سەیری لایتە سوورەکەم دەکرد کە لەناکاودا سەرم بەرزکردەوە، ئاسۆی بەرامبەرمان بەو شەوە وردە وردە ڕۆشنایی تیێ دەزا.

سەرم سووڕما، بەئەسپایی بە«م»م وت:

«ئەم ڕۆشناییە چییە؟»

ئەویش هەر سەرنجی بەرامبەری خۆی دەدا و بێ ئەوەی دانیشتنەکەی خۆی تێك بدا لەبەر خۆیەوە، کە بەئاستەم گوێم لێ بوو، وتی:

«ڕۆشنایی چراکانی گەڤەرە!»

تا لە لایتەکەش نزیك دەبووینەوە، تەمی دیمەنەکەی بەرامبەرمان زیاتر دەرەوییەوە، وردە وردە نزیك دەبووینەوە تارماییی دەیان مرۆڤ لەمبەر و ئەوبەری ڕێگەکە دەرکەوتن. دڵم تەواو داخورپا، پۆلیسی گومرگی چی ئەمانە هەمووی سەربازی کۆماندۆی پڕ چەك و جبەبوون.

گەیشتینە بەردەم لایتەکە و ئەوسا بەئاشکرا سەربازەکانمان بەدی کرد کە هەموو لە دۆخی ئامادەباشی دابوون.

شوفێرەکە ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرت، دەیان (ژێ- سێ) هێنرایە سەرپێ لێمان. شریخەی ڕاکێشانی میلی تفەنگ و هاواری ئەفسەری پشتی لایتەکە و هەڵمەتی سەربازەکان بۆ سەر ئۆتۆمبیلکەمان گومانی لە کەوتنە ناو بووسەیەکی سەربازییەوە، بڕی، لوولەی تفەنگەکانیان لە پەنجەرەی ئۆتۆمبێلەکەوە لەسەر سنگمان چەقاند و سەربازێکی سێ خەت بەلایتێکی گەورەی گەلێ بەهێزەوە، کەوتە تیشك لێدانمان. مۆڵەتی هیچیان نەداین، و دەرگای ئۆتۆمبێلەکەیان بەتوندی کردەوە و بێ هیچ پرسیارێك بەڕاکێشان فڕێیان داینە خوارێ و لەسەر بەفرەکە، لەسەر دەم، پاڵیان خستین. یەکێك لە سەربازەکان قوناغە تفەنگێکی بەهێزی لە پشتم دا و دوو سەربازی تریش هەریەکەو، دەستێکیان گرتم و لە پشتەوە کەلەپچەیان کردم. دەمم لە بەفرەکە چەقی بوو، هەستم بەساردی بەفرەکە دەکرد کە وردە وردە لە ملیوانی فانیلەکەمەوە بۆ سنگم ڕۆدەچوو، سەربازێك پۆستاڵەکەی لەسەر پشتم دانا و بەتوندی گوشاری بەلاقی دەدا و وەك ئەوەی بیەوێ هەر لەوێدا بمتاسێنێ، ملم کەمێك بەلای چەپدا وەرچەرخاند، وەزعی «م» لە من چاتر نەبوو، ئەویش لە سەردەم کەوتبوو بەڵام ڕووی لە من نەبوو هاوکات گوێم لە هاواری شوفێرەکەمان بوو کە لە ژێر لێداندا دەیباڕاند.

دوو سەرباز دەستیان دایە بن هەنگڵم و بەرزیان کردمەوە و بردمیانە بەردەم ئەفسەرەکەیان. ئەفسەرەکە چەند پرسیارێکی لێ کردم کە دیارە

هیچی لێ تێ نەگەیشتم بۆیە بەهەموو توانای زللەیەکی تێ سرەواندم.

بەلەقە کەوتنە سەر پشتی «م» پاشان، وەك من، دەستیان دایە ژێر شانی، ئەویشیان هێنایە بەردەم ئەفسەرەکە، چاوێکی خێرام بەدەوروپشتی خۆمدا خشاند، دەیان سەربازی خودە بەسەر بەدەورمانەوە بوون. ڕەنگوڕووو و جل و بەرگ و چەکەکانیان هەمووی نیشانەی ئەوە بوون کە ئەمانە سەربازی تایبەتین و پۆلیسی قاچاغ نیین.

ئەفسەرەکە، جارێکی تر، زۆر بەتوندی، بەسەرمدا هەڵشاخی و منیش بۆ ئەوەی وای نیشان بدەم کە منیش خەڵکی ئەو ناوچە سنووریانەم وتم:

«ئەز تورکی نازانم!»

ئەفسەرەکە دایە قاقای پێکەنین و دەقاودەق لاسایی کردمەوە و وتی:

«ئەز تورك نەزان!!» ئەمەی وت و هەتا توانیی زللەکی تری کێشا بەپەناگوێمدا و هەندێ قسەی تری لەگەڵدا کردم کە دیارە هیچ حاڵی نەبووم بۆیە شانی «م»ی ڕاکێشا و هێنایە بەردەمم و جارێکی تر کەوتەوە هاوار هاوار بەسەرما. «م» وتی:

«ئەڵێ خەڵکی کوێی؟»

یەکسەر بێ بیرکردنەوە وتم:

«سووریا!»

ئەفسەرەکە چاوی زەق بوو، وتی:

«سورریا؟؟»

پاشان تا توانی بۆکسێکی لێ دام و فەرمانی بەسەربازەکانی دا، لە چاو تروووکانێکدا من و «م»یان فڕێ دایە پشتی لۆرییەکی سەربازییەوە و چەند سەربازێك لەگەڵماندا سوار بوون.

بۆسە سەربازییەکە تایبەت بوو بە ئێمە، چونکە کە ئێمەیان گرت، ئیدی بوسەکەیان هەڵگرت و ئەو ناوچەیان بەجێ هێشت، کە ئەوەش زیاتر دڵخورتی کردم، و هەر ئەوەش سەلماندی کە ئەو بۆسەیە بۆ ئێمە دانرابێ و سوپای تورکی، پێشەکی، لە هاتنەکەی ئێمە ئاگادار کرابێ.

زۆ بەزەحمەت، لە پشتی لۆرییەکەدا، خۆم بۆ ڕادەگیرا، چونکە دەستم کەلەبچە کرابوو ناچاربووم قاچم بەتوندی لە بنی لۆرییەکە گیر بکەم، بەلاچاو سەیری «م»م کرد، ئەویش نوقمی بیرکردنەوە بوو، بەئەسپایی پێم وت:

«ئەو بەڵایە چی بوو؟»

یەکێك لە سەربازەکان گوێی لە دەنگم بوو، بۆیە بەهەموو هێزی قۆناغە تفەنگێکی لە سینگم دا و لەسەر کورسیەکە خستمیە خوارێ، یەك دوو سەربازی تر بڕێ قسەیان کرد و هەڵیان ساندمەوە و لە جێگەی پێشووم دایان نامەوە. پشتی ئۆتۆمبێلەکە بێ ئەندازە سارد بوو، کورسییە ئاسنینەکانی ژێریشمان هەر پارچەیەك سەهۆڵ بوون.

سەربازەکان کەوتنە گۆرانی وتن، دیار بوو زۆر بەگرتنمان کەیفداربوون، یەکێك لە سەربازەکان جارویارسەری لە من دەهێنایە پێشەوە شتێکی دەوت.

لە تاسەیەکدا بە«م» وت:

«ئەوە چی دەڵێ؟»

«م» بێدەنگ بوو، لە فرسەتێکدا لە ژێر لێوەوە وتی:

«جنێو دەدات!»

ئەوەی بەخەیاڵمدا نەدەهات ئەوە بوو کە بکەوینە داوێکی واوە. من، زیاتر، ترسم لە سەیتەرەکان هەبوو کە لێی دەرباز نەبین، کەچی تووشی بۆسەی سەربازی بووین.

لۆرییەکە زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت و لە هەموو هەڵبەز و دابەزینێکدا، گەرپەنجەم لە ئەڵقەیەکی چادرەکەی پشتەوەم گیر نەکردبا، بێگومان بەسەردا دەکەوتم، ڕووناکیی ئەلیکتریکەکانی سەرجادەکان ڕادەی نزیکبوونەوەمانی لە گەڤەر نیشان دەدا.

هێندەی نەبرد گەیشتینە شاری «گەڤەر»، بەوەی کەس لەسەر شەقام و کۆڵانەکاندا نەدەبینران درەنگ وەختی شەوی نیشان دەدا. تابلۆیەکی گەورە لە داخڵ بوونی شاردا لێی نووسرابوو: یوکوساکوڤا:

لورییەکە، ماوەیەك بەناو شاری گەڤەردا، ڕۆیشت، بەڵام لە هیچ شوێنێك نەوەستا و پاشان لۆرییەکەمان لە شار دەرچوو، شاریش وردە وردە لە چاو ون دەبوو. لە دڵی خۆمدا وتم:

«تۆ بڵێی بۆ ئەنقەرەمان نەبەن؟»

کە تەواو گڵۆپەکانی شاری، گەڤەر لە بەرچاو، نەمان لۆرییەکەشمان خێرایی هێواش کردەوە و پاشان بەیەکجاری لە بەردەم سەربازگەیەکدا ڕاوەستا، لە ڕاستیدا هیچ تێی نەدەگەیشتم، بۆچی بۆ سەربازگەمان دەبەن، لە پشتی لۆرییەکە دایانگرتینە خوارێ، چاوم گێڕا شوفێر و ئۆتۆمبێلەکەیم نەدی بەوەش کەمێ دڵخۆش بووم و لە دڵی خۆمدا وتم:

«بەشکو ئەمە خوایە یەکسەر بەریان دابێ»

چەند سەربازێك لە پشتمانەوە دەڕۆیشتن، چوار پێنجێکیان، کە لوولەی تفەنگەکەیان لە پشتمان چەقاندبوو، لە دوامانەوە بوون، لە بەردەم بینایەکی بەرز و نوێدا کە دیکۆرەکەی نا ئاسایی ڕێکوپێك بوو، ڕایان گرتین و پاش ساتێ بردینیانە نێو بیناکەوە، ئیتر هەر لەوێ ڕاستەوخۆ لە یەکتریان جوێ کردینەوە.

منیان بردە ژوورێکی نزیك دەرگای دەرەوە. ئەوەی لە ژوورەکەدا

سەرنجی ڕاکێشام ئامێرێکی بێ تەل بوو کە لەسەر مێزێك دانرابوو، سەربازێك لەگەڵمدا هاتە ژوورێ، زنجیرێکی بەدەستەوە بوو، سەرێکی زنجیرەکەی بەکەلەپچەکەمەوە گرێ داو و سەرەکەی تری بە شۆڤاجی ژوورەکەوە بەست و پاڵێکی توندی پێوەنام و بەتوندی گوشاری خستە سەرشانەکانم، دیار بوو مەبەستی ئەوەبوو لە پاڵ شۆڤاجەکەدا دابنیشم.

سەربازەکە چووە دەرێ و پاش ساتێ گەڕایەوە، کورسییەکی حەیزەرانی لەگەڵ خۆیدا هێنا و بەرامبەرم دانیشت. من لە پاڵ شۆڤاجەکەدا هەڵتروشکابووم. بای ژوورەکە هیچ لەگەڵ دەرەوەدا جیاوازی نەبوو، لەوە نەدەچوو لەو ژوورەدا هەرگیز ئاگر کرابێتەوە، بۆیە هەستم بەسەرمایەکی جەرگ بڕ دەکرد، سەرمایەك کە هەروەك درك لە لەشم هەڵدەچەقی و تا دەهات پتر تەنگەتاوی دەکردم.

ویستم بەجۆرێك ئارەزووی سەرئاوی نیشان بدەم. بەڵام وەڵامی ئەو تەنیا لوولەی تفەنگەکەی بۆ سەر سنگم بوو، بۆیە منیش، کەوتمە هەوڵی ئەوەی مەسەلەی چوونە سەرئاو لە بیر خۆم ببەمەوە، بۆ ئەوەش خەیاڵم دایەوە لای شوفێرەکە و لە دڵی خۆمدا وتم:

«تۆ بڵێی پاسەپۆرت و نامەکان نەگیرابن؟»

نازانم چەندی پێ چوو کە سەربازێك لە دەرگای داو هاتە ژوورەوە بۆ لامان بڕێك بەگوێی سەربازە پاسەوانەکەی مندا چرپاندی و پاشان زنجیرەکەیان لە شۆڤاجەکە کردەوە و سەربازە نوێیەکە پێش خۆی دام. بەپلیکانەیەکدا، بۆ نهۆمی دووەم، سەرکەوتین، ماوەیەك ڕایان گرتم و پاشان بۆ ژوورێك پێش خۆیان دام.

لە ژوورەکەدا هەر ئەو ئەفسەرەی کە لە گرتنەکەمدا بەشداریی کردبوو دانیشتبوو، عەریفێ، بەپێوە، لای ڕاستی مێزەکەیەوە ڕاوەستابوو. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام گڵۆپی ژووری ئەفسەرەکە بوو کە جارویار دەکوژایەوە

و پاشان هەڵدەبووەوە لە ڕاستیدا، ئەو کاتە، لەو نهێنییە نەدەگەیشتم، دیمەنێکی سەیر و تەواو ترسناکیش بەو دەورویەرە دەدا.

وێنەیەکی گەورەی مستەفا کەمال، کە لە پشت سەری ئەفسەرەکەوە، هەڵواسرابوو، لە کوژانەوە و هەڵگیرسانەوەی گڵۆپەکەدا، دەبینرا، وەك تەنیا بەگومانەوە سەیری من بکات، وابوو.

ئەفسەرەکە کەوتە قسە، زۆری ڕست، کە هیچی لێ تێ نەگەیشتم. لام سەیر بوو، بۆ لای ئەمانە هەرچی مرۆڤی سەر ڕووی ئەم زەمینەیە، دەبێ تورکی بزانێ، لە قسەکانی هەر سەرم بادەدا کە لەناکاودا یەك مستەکۆڵەی دا بەسەر مێزەکەیدا بۆیە، منیش بەناچاری، بەئینگلیزی پێم وت:

«من تورکی نازانم گەر ئینگلیزی دەزانن، فەرموون، با قسە بکەین».

قسەکانم، ئەوەندەی تر، هاریکرد، هەستایە سەرپێ و بەتوندی یەخەی گرتم و چەند جارێك ڕای وەشاندم و هەر بەتورکی دەیقیژاند. لە ڕاستیدا سەرم لە بێ ئەقڵیی ئەفسەرەکە سووڕ دەما، بۆیە ئەمجارەیان پێم وت:

«یان، کەسێك بهێنن، کوردی بزانێت»

بەبیستنی وشەی کورد، ئەفسەرەکە، ئەوەندەی تر، توڕە بوو، دیارە لای ئەمان، کە بەڕسمی کورد وجودی نەبێ، ئیدی، چۆن دەبێ زمانێك هەبێت کە کوردی بێت.

ئەفسەرەکە ماوەیەك داما و پاشان چووە لای عەریفەکە و برێ بەگوێیدا چرپاند.

عەریفەکە چووە دەرێ و ئەفسەرەکەش چووە پشت مێزەکەی خۆی دانیشتەوە. بەلاچاو سەیری پەنجەرەی ژوورەکەم کرد، دەمویست تۆزێ زانیاری لەسەر دەورویەر هەڵکرێنم، بەلام بێ سوود بوو. کرکرەی پەنجەرەکە هیچ مۆڵەتێکی لەو بابەتەی نەدەدا. ئەفسەرەکە پەنجەی دەستی

بێ ئارامانە دەکوتا بەمێزەکەی بەردەمیدا. زۆر پەست و تورە دەهاتە پێش چاو، عەریفەکە هاتەوە ژووریٚ و سەربازێکیشی بەدواوە بوو.

سەربازەکە رێوەڵەیەکی رەنگ پەریو بوو، لەوە دەچوو خۆی زۆر بەبچووك بەرامبەر ئەفسەرەکە بێتە پێش چاو، چونکە وەك سەربازێك، بروای بەخۆی بێت، رانەوەستا بوو، ئەم زیاتر لە جووتیارێکی زەلیلی بەردەم ئاغایەکی دەکرد.

ئەفسەرەکە کەوتە قسە، ئەمجارەیان سەربازەکە رووی تێ کردم و کەوتە تەرجومەی قسەکانی، شتێك حاڵی بووم بەڵام زۆر بەزەحمەت. ئەم سەربازە زازا بوو، بۆیە هەر هیچ لە قسەکانی من نەدەگەیشت و هەر ئەوەش ئەوەندەی تر ئەفسەرەکەی کەللەیی کرد.

عەریفەکە هەستایە سەرپێ و کەوتە پشکنینی هەموو گیانم. لە گیرفانی ناوەوەی چاکەتەکەمدا پێنج سەد دیناری عێراقی و سەد و پەنجا هەزار لیرەی تورکیی دەرهێنا و خستیە سەرمێزی ئەفسەرەکە، ئەویش بەسەرسوورمانەوە کەوتە ژماردنی پارە عێراقییەکان و هەر سەری بادەدا و لەوە دەچوو لە نرخی دراوی عێراقی حاڵی نەبوویێ، چونکە هەر دەیژمارد و دەیژماردەوە و پاشان سەیرێکی عەریفەکەی کرد و فیکەیەکی لیٚ دا کە دیار بوو مەبەستی زۆری ئەو پارەیە بوو. پارە تورکییەکانیان دایەوە دەستم و پاشان، ئەفسەرەکە، پارە عێراقییەکانی لە کاغەزێکەوە پێچا و خستیە ناو چەکمەجەی مێزەکەیەوە.

ئەفسەر چرپانی بەگوێی عەریفەکەدا و ئەویش پەلی گرتم و بردمیە دەریٚ. پاساوانەکەم رەق لە بەردەرگا راوەستا بوو، کەلەپچەکانی کردەوە دەستم و بەرەو ژوورەکەی پێشوو بردمیەوە.

لە ژوورەکەدا، وەك جاری پێشوو، بەشۆفاجەکەوە بەستمیەوە و خۆی چووە دەریٚ و پاش ساتێك گەرایەوە، ئەمجارەیان رادیۆیەکی پیٚ بوو، لەسەر

کورسییەکە دانیشت و کەوتە بادانی میلی ڕادیۆکە. زۆرم لا سەیر بوو ئەمانە منیان بەزنجیر بەستووەتەوە کەچی سەربازێکیش بەتفەنگێکەوە هەر لە ژوورەکەدا بەرامبەرم دانیشتووە، سەرم سووڕمابوو لەو هەڵسوکەوتە نەدمگەیشتم. ئەمە زیندانی تایبەتی بێ یا هەر زیندان لە تورکیا بەمجۆرەیە، تۆ بڵێی ئەمانە هێند زانیاریان لە سەرم هەبێ و بزانن کە ماوەیەك لەوەوبەر لە یەکێك لە زیندانە نهێنییەکانی عێراق، کە ناسراوە بەهەیئەی کەرکووك، ڕای کردبێ. گەرنا ئەم ڕەفتارەی ئەمان هیچ پاساوێکی نەبوو. پیاو کەلەپچە بکرێ و پاشان بەزنجیر بەشۆڤاجێکەوە ببەسترێتەوە کەچی سەرەڕای ئەوەش سەربازێك، بەتفەنگێکەوە، بەرامبەری دابنیشێ، تێ نەدمگەیشتم.

سەربازەکە هەر میلی ڕادیۆکەی بەملاو لادا بادەدا، دیار بوو بەو درەنگ وەختە بۆ ئێستگەیەك دەگەڕا، بەڵام بێ سوود بوو، جا بێ کەڵکیی ڕادیۆکە خۆی بوو یا وەك بڵێین ئاووهەوا لەم شارە دوورە دەستە ناجۆر بوو، هەر کامیان بێ ئەوی بەگۆرانی دڵخوازی خۆی شاد نەکرد، هەربۆیەش ڕادیۆکەی لەسەر زەوی بەتووڕەییەوە دانا کە هەر کڕەکڕی بوو، دیار بوو ئەوەش هەر بەشێك لە ئازاردان، بوو گەرنا هیچ مانایەکی تری نەدەبەخشی.

سەرما و تەنگەتاویی، پەستی، دەنگی ناسازی ڕادیۆکەش هاتە سەری، بۆیە بەتەواوی بێ تاقەت بووم و سەرم دنگەی دەهات. ئەگەرچی خەو تەواو تینی بۆ هێنا بووم، بەڵام، بەهیچ شێوەیەك، مۆڵەتم نەبوو ڕاکشێم، بەتەواوی هەستم بەساردی لوولەی شۆڤاجەکە دەکرد، بەڵام ئەوەشم تا سەر بۆ نەدەڕەخسا؛ چونکە هەر پاش ساتێك، هیلاکی تینی بۆ دەهێنام و بە ناچاری پشتم دەدایەوە بەشۆفاجەکەوە. ویستم وەزعی ناجۆرم بەم شێوەیە لە پاسەوانەکەیگەیەنم، بەڵام هەموو هەوڵێکم هەر بەلوولەی تفەنگەکەی، وەڵامی دەدرایەوە.

پاسەوانەکە جارویار لە خۆیەوە پێ دەکەنی و هەندێ جاریش بەتوندی لێم مۆڕ دەبوووە، لەو هەلسوکەوتە سەیرەی نەدەگەیشتم، بۆیە منیش هەوا بەساردییەوە تێم دەڕوانی.

سەربازەکە لەناکاوێکدا هەستایە سەرپێ و برێ سەیری کردم و پاشان چووە دەرێ، پاش ساتێك گەڕایەوە، بەتانییەکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، لە سەرەتادا دڵخۆش بوو و وەمزانی هەستی بەزەیی بزواوە و بەتانییەکەی بۆ من هێناوە، بەلاّم بەهەڵەداچووم چونکە لەسەر کورسییەکەی دانیشتەوە و بەتانییەکەی لە خۆیەوە ئالاّند.

ڕادیۆکە هەر کرەکرِی بوو، دیار بوو هێندەی منی بێزار دەکرد، ئەوەندەش سەربازەکەی بێزار دەکرد، هەر بۆیەش بەجوولاّندنیەێکی پەلە کوژاندیەوە.

بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر ژوورەکەدا، منیش کەوتمە بیرکردنەوە لە رۆژی دوایی، کەچی بڵێم وەك لە وەلاّمی پرسیاری ئەفسەرەکەدا، کاتی گرتنەکەم، وتبووم خەڵکی سووریام، دەمویست هەر لەسەر ئەو بانگاشەیە بەردەوام بم، بەلاّم دڵخورتیش بووم. من هەرگیز سووریام نەدیبوو نەمدەزانی بڵێم خەڵکی کوێی سووریام، زۆر بیرم لە قامیشلی کردەوە، چونکە بیستبووم شارێکی کوردی سەرسنوورە و هەندێ بارەگای حیزبی کوردستانی عێراقیشی لێیە، بەلاّم گەر پرسیار کرا کە خەڵکی کام گەڕەکی قامیشلیم ئەوسا چی بڵێم؟ سەرم گێژی دەخوارد و نەمدەزانی ئەم تەلیسمە چۆن چارەسەر بکەم. ماوەیەك هەوا بەهێواشی ئەم گیروگرفتەم تاووتوێ دەکرد کە لە پڕێکدا خەیاڵم بۆ ئەوە چوو، بڵێم: بەڵێ خەڵکی قامیشلیم و ماڵمان لای گەڕەکی مزگەوتی قامیشلییەوەیە.

گومانم لەوەدا نەبوو کە لە هەموو شار و شارۆچکەیەکی کوردستاندا، مزگەوتێ هەبێ، بۆیە ئەو بانگاشەیەش بەعەقڵدا دەچوو.

خەیاڵم گواستەوە بۆ لای «م»، دەبێ، چی وتبێت، چی بەسەر هاتبێت. من

لەلای خۆمەوە بڕیارم دابوو کە بڵێم نایناسم و بەسودفە لە تومبێلەکەدا پێکەوە بووین. من خۆم تووش بووم و بۆ کەسێکی تر تێوە بگلێنم.

سەرنجم دایە سەربازەکە، دیمەنێکی سەیری هەبوو، پاش ئەوەی بەتانییەکەی لە خۆیەوە ئالاند لە پەیکەرێکی ناقۆلا دەچوو، کە دەستی هونەرمەندێکی نەشارەزا خولقاندبێتی، ئەو خەوی لێ کەوت و منیش لە سەرما، هەر، هەڵدەلەرزیم و چاوەڕێی ڕۆژ بوونەوەم دەکرد.

دەمەو بەیانی تەقوهۆڕ کەوتە ناو ساڵۆنەکەی بەردەممان و هەر ئەوەش پاسەوانەکەی بەئاگا هێنایەوە و بەپەلە بەتانییەکەی لە خۆی کردەوە و سەیری کاتژمێرەکەی مەچەکی کردوو یەکسەر دەرپەڕی. بەتەنیا لە ژوورەکەدا بووم، ناو دەمم بوویبوو بەپەلاس. برسیتی تەواو تینی بۆ هێنابووم و هەموو گیانیشم ڕەق هەڵاتبوو، سەرەڕای ئەوەش خەوێکی سەیرم دەهات و ناوچاوەکانم دەبرژانەوە.

کاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی بردمیانە سەرئاو، نوێ بوومەوە، ئای، نەهێشتنی چوونە سەرئاو، چ ئازاردانێکە کە هەرگیز لەگەڵ ئەشکەنجەی فیزیکیدا بەراورد ناکرێ.

لە ژیانمدا ئازاردانی گیانیم زۆر چەشتووە، بەڵام هیچیان، وەك ئەم جۆرە، ئازارە کاریان تێ نەکردووم.

پێش نیوەڕۆ بردمیانەوە بۆ لێپرسینەوە. ئەمجارەیان سەربازێکی تر تەرجومەی دەکرد کە تۆزێ باشتر لە یەك دەگەیشتین. ئەفسەرەکە ڕاستەوخۆ کەوتە پرسیار،

«ناوت؟»

وەك شەو بڕیارم دابوو کە ناو و نیشانی خۆم بگۆڕم و خۆم بەکەسایەتی نوێ پێشکەش بکەم، وتم:

«حەسەن عەبدولقادر!»

ئەفسەرەکە وتی:

«ئاوا... ئەی خەڵکی کوێت؟»

بەدڵنیاییەوە وتم:

«سووریا»

ئەفسەرەکە بەوردی سەیری دەکردم و وتی: کوێی سووریا؟

خۆم قیت کردەوە وتم:

«قامیشلی» ئەفسەرەکە یەکێك لە چەکمەجەکانی مێزەکەی کردەووە و زەرفێکی ئەستووری دەرهێنا و زۆر بەشێنەیی ناواخنی زەرفەکەی دەرهێنا و پاشان دایە قاقای پێکەنین. پەساپۆرت و نامەکان لەسەر مێزەکە بوون. ئەفسەرەکە پەساپۆرتە عێراقییەکەی هەڵگرت و برێ تاوتوێی کرد و پاشان کەوتە بەراوردی خۆم و وێنەکەم و دوایی بەتەوسەوە: وتی:

«سووریا؟ قامیشلی؟!»

هەموو شتێ تەواو بوو، هیوای خۆگۆڕین و خۆگێل کردن بەهیچ دەچوو. پەساپۆرت و نامەکان بەڵگەنامەی حاشاهەڵنەگربوون. ئەفسەرەکە بەمۆڕەیەکەوە کە غەزەبی لێ دەتکا وتی:

«تۆ عێراقیت و کابرایەکی یاخیشیت»

نکۆڵی، بێ عەقڵیەتی دەنواند، بۆیە وتم:

«وایە، بەڵام من بابایەکی یاخینیم و پێشمەرگەم»

ئەفسەرەکە چاوی پەڕییە پشتی سەری و بەهەموو هێزی قیژاندی بەسەرمدا: «دەڵێم تۆ یاخیت»

مشتومڕ، بێ سوود بوو، ئەوان، دانیان بە(دە)(*) ملیۆن کوردا نەدەنا، ئیدی چۆن ئەوەیان دەسەلماند، کە کورد، پێشمەرگەی هەبێ.

ئەفسەرەکە هەر دانە جیڕەی بوو، جاروباریش شتێکی لەسەر کاغەزەکەی بەردەمی دەنووسی. من هەر سەیری پەساپۆرت و نامەکانم دەکرد، نامەیەك دیار نەبوو، بەڵام خۆی سێ نامەی پێچراوە بوون و سەرمێزەکە تەنیا دوانی لێ بوو، ئەوەش کەمێك دڵخۆشی کردم. نامەی سێیەم بۆ لێپرسراوێکی گەورەی سووریا بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا دڵم داخوریا و لە دڵی خۆمدا وتم:

«تۆ بڵێی ئەو نامەیە یان بەتایبەتی، جیا نەکردبێتەوە و تەسلیمی دەستگای پۆلیسی نهێنیی خۆیان نەکرد بێ؟»

ئەفسەرەکە لە نووسین بووەوە و سەری هەڵبڕی و بەتوڕەییەوە وتی:

«ئەم یاخییە بەرنەدرێ»

هەروەك پێشوو، بردیانمە ژوورە ساردەکە، ئەمجارەیان کە بەستمیانەوە کەس لە ژوورەکەدا نەما و دەرگایان لەسەر داخستم.

بەتەنیشت شۆفاجە ساردەکەوە هەڵتروشکامەوە. تینویەتی تەواو تینی بۆ هێنام، لە داڵغەی ئەوەدا بووم کە چۆن لەمانە بگەیێنم کەوا خەریکە لە تینوێتیدا دەخنکێم و سەرەڕای ئەوەش بەتورکی دەبێ بەئاو بڵێن چی؟.

دەمەو نیوەڕۆ، دەرگایان لێ کردمەوە و، قاپێك شۆربا و سەموونێکیان لە بەردەمم دانا. ئای بەچ تامەزرۆییەکە ئەو سەموونەم لە شۆرباکە هەڵدەکێشا و بەچ لەزەتێکەوە هەڵم دەلووشی.

ئەوە لە گرتنەکەمەوە یەکەمین وەجبەی نانخواردنم بوو،

پاش نیوەڕۆ هەستم هەر لای پاسەپۆرت و نامەکان بوو، ئێستا، کە

---

(*) مەزەندەی سالی ١٩٧٨

دەزانن من خەڵکی دیوی عێراقم، بێگومان، دەمنێرنەوە بۆ ئەودیوو. ئای لەو دیویش چ کارەساتێك چاوەڕوانم دەکات. هەر بیرکردنەوە لە دیوی عێراق ئیتر زیندانە نهێنییەکانی بەعس، بەتایبەتی «هەیئە»، دەهاتەوە یادم، ڕۆژەکانی پاشماوەی ژیانم بەپەنجەی دەست دەژمێردرا.

دەمەو ئێواریّ دەرگاکەیان لیّ کردمەوە و پاش کردنەوەی زنجیرەکە پێش خۆیان دام و بردمیانە ژوورێکی ترەوە لەویّ عەریفێکی لاو، بەتەنیا، لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو. بەدەست ئیشارەتی بۆ کردم کە لەسەر کورسییەکی تەنیشت مێزەکەی دابنیشم. ڕەفتارێکی سەرنجڕاکێش بوو کە سەرسامی کردم. هێندەی نەبرد سەربازێك خۆی کرد بەژووردا، هەمان سەربازی یەکەم شەوبوو، بابای زازام. عەریفەکە کەوتە قسەکردن، بەتورکی، دیارە من هیچ حاڵی نەدەبووم، بۆیە هەر سەرم بادەدا و لە ناچاریدا بەئینگلیزی وتم:

«ئەمە چەند ڕۆژێکە من هەر دەڵێم تورکی نازانم کەچی ئێوە هەربەتورکی قسەم لەگەڵ دەکەن»

عەریفەکە سەری لەقاند و بەئینگلیزییەکی یەکجار شەق و شڕ وتی:

«بۆیە ئەم سەربازە هاتووە، تەرجومانی بۆ ئێمە دەکات»

پاشان خۆی پێشکەش کردم، کە ناوی «یوسف»ە و خەڵکی یەکێك لە شارەکانی سەر دەریای ڕەشە و ئێستاش، بەنامە، خەریکی خوێندنە، قسەکانی زازا، ئەمجارەیان بریّ باشتر بوو، گوێم کەمیّ ئاشنا بووبوو وەك شەوی یەکەم یەکجار وشەکانی نامۆ نەدەهاتە بەرگوێم، ئەگەرچی هەر بەزەحمەت تیّ دەگەیشتم.

عەریفەکە کەوتە پرسیارکردن لێم، دەیویست ڕادەی خوێندەواریم تیّ بگات، هەر بۆیەش پارچەیەك کاغەزی سپی دەرهێنا و هاوکێشەیەکی زۆر سادەی ماتماتیکی لەسەر نووسی و داوای چارەسەرکردنی لیّ کردم.

لەوە دەچوو، ئەمانە بڕوا نەکەن کورد خوێندەواریشی تیا بێ.

لە ڕاستیدا من سەرم سووڕما بوو، تێ نەدەگەیشتم. من لەسەر سیاسەت گیراوم و ئێستا تاقیکردنەوەی ماتماتیکم لێ داوا دەکەن!

بەهەرحاڵ من هاوکێشەکەم، کە لە ئاستی پۆلی دووەمی ناوەندیدا دەبوو، بۆ چارەسەرکرد، زۆر بەوردی لە کاغەزەکەی دەڕوانی و بەڕووخۆشییەوە پێی وتم:

«ڕاستە... تۆ خوێندەواری»

پاش تۆزێك داوای چایەکی بۆ کردم و پاشان وتی:

«دەشتوانی، تا لێرە بیت، کەمێ یارمەتیی ماتماتیکیم بدەی!!»

چاکەیان بۆ هێنام، ئەویش وردە وردە کەوتە باسی خۆی، کە تا پۆلی سێی ناوەندی خوێندوە هەر بەردەوامیشە، دەیەوێ پۆلی سێ تەواوکات، ئیتر واز لە سەربازی بهێنێ.

ئینجا کەوتە قسە و بەجۆرێکی تەمومژاوی نیشانی دا کە لایەنگری حزبەکەی ئیجاڤیدایە و خۆشی، تا ڕادەیەك، بەلایەنگری سوسیالیزم دادەنا، هاوکات ڕەخنەی لە حیزبەکەی سلێمان دیمریل دەگرت و نیگەرانی و ناڕەزایی خۆی دەرهەق بەڕاسترەوان لە نێو سوپادا نیشان دەدا و باسی ئەوەشی کرد کە دەسەڵاتی ڕاسترەوان، لە نێو سوپای تورکدا، هێندە بەهێزە کە بەدەگمەن ڕێك دەکەوێ، کەسێك لە زانستگای ئەفسەری قەبووڵ بکرێ، گەر ڕاسترەوێکی بێ ئەندازە و شۆڤینیەکی خەستوخۆڵ نەبێ!.

لە ڕاستیدا قسەکانی، هێند، بۆ من نامۆ بوون، کە لە سەرەتادا، وامدەزانی دەیەوێ قسەم لێ دەربهێنێ، کە لە گەوهەردا گومانێکی بێ بنەما بوو، چونکە ئەو قسەی دەکرد و من هەر گوێگر بووم.

بەپێی قسەکانی «یوسف»، لەوە دەچوو لاوێکی هوشیار بێ و حەزیشی

دەکرد، هەر لەو دانیشتنەدا، کە وام نیشان بدات لە گرتنم نارەحەتە، بەڵام ئەو لەو باوەڕەدایە کە هیچی بۆ ناکرێ. لە هەستاندا، تا بەر دەرگای ژوورەکە، لەگەڵمدا هات، لەوێشدا بەپاسەوانەکەی وت کە نەمباتەوە ژوورەکەی پێشووم.

پاسەوانەکە پێش خۆی دام و نەیبردمەوە ژوورە ساردەکەی. پێشووم لەباتی بردمیە ناو هۆڵی ڕستۆرانی سەربازگەکەوە و لەوێ لە سووچێکی ژوورەکەدا، بەشۆڤاجێکەوە بەستمیانەوە.

هۆڵەکە، هەر بەراورد نەدەکرا، لەگەڵ ژوورەکەی پێشوودا، ئێرە تەواو گەرم و فراوان بوو. لە دڵەوە سوپاسێکی گەرمی «یوسف»م کرد.

دەمەو ئێواریّ، پێش نانخواردن، سەربازەکان وردە وردە دەهاتن و لەسەر کورسی و لەدەوری مێزی نانخواردنەکان گرد دەبوونەوە، لەو کاتەدا، یوسف خۆی بەرستۆرانەکەدا کرد، لە دوورەوە سڵاوێکی لیّ کردم و پاشان لەگەڵ سەربازەکان کەوتە گفتوگۆ. دیار بوو باسی منی دەکرد چونکە، لە قسەکردنەکەیدا، چەند جارێك ئیشارەتی بۆ من کرد.

پاش چوونە دەرەوەی، سەربازەکان لە دەورم کۆبوونەوە و کەوتنە قسە، کە هەر تەقەی سەرم دەهات، یەکێك لە سەربازەکان هەستا و پاش ساتێك گەڕایەوە و لەگەڵ خۆیدا سەرینێك و بەتانییەکی هێنا و لە تەنیشتمەوە دای نا. بەڕەفتارەکەیاندا لەوە دەچوو (عەریف یوسف) فەرمانی پیّ دابن کە ڕێزم بگرن.

ئەگەرچی بەکەلەپچە و زنجیر بەسترابوومەوە، بەڵام هەڵسوکەوتی سەربازەکان گەلیّ جیاواز بوو، هەروەك هۆڵی ڕستوانەکەش بۆ من، لەو کاتەدا، بەبەراورد لەگەڵ ژوورە ساردەکەی پێشوومدا، لووتکە بوو.

دوای نانخواردنی ئێواریّ، سەربازەکان، جارێکی تر، دەورەیان دامەوە، ئەمجارەیان سەربازێکیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ تەرجوومە هێنابوو.

هەموو گەنجی هەژدە و نۆزدە ساڵان بوون، یەکە یەکە کەوتنە پرسیار لێم، ئەمانە زۆریان لا سەیر بوو، کە پیاوێکی خوێندەوار، زمانێکی ئەوروپی بزانێ و جلوبەرگی ئەوروپی لەبەردابێ، لەگەڵ ئەوەش پێشمەرگە بووبێ.

تەلیسمێك بوو بۆیان چارەسەر نەدەکرا. لەوە دەچوو ئەوانە کوردیان تەنیا لەو شاخ و کێوە، بەهەژاری و نەداری و کەساسی و نەخوێندەواری دی بێ، بۆیە وا بەسەرسووڕمانەوە تێیان دەڕوانیم و گوێیان بۆ قسەکانم، کە دەربارەی کوردستانی عێراق و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی بوو، بەبایەخەوە شل کردبوو.

هەر ئەو شەوە بۆم دەرکەوت، کە زۆربەی سەربازەکان، لارییان لە بوونی کورد لە تورکیا نەبوو، جا لەبەرئەوە بووبێ کە ئەوان سەربازی تازەبوون و هێشتا، پڕۆپاگەندەی ژەهراویی کۆنەپەرستان و کەمالیستەکانی نێو سوپای تورکیا کاری تێ نەکردبوون، یاخود خۆیان لاوی هۆشیار و تێگەیشتوو بوون یان سیاسەتی ناواقیعیی ڕژێمی تورك، دەرهەق بەکوردیان، بەئەقڵدا نەدەچوو، هەر کامیان بوو بن یان هەر لەبەر خاتری من بووبێ، ئەوە نازانم، ئەمانە، هیچیان بەرەو ڕوو، لاری لە بوونی کورد لە تورکیا نەبوو.

ڕۆژی دوایی پاش نیوەڕۆ «م»یان هێنا. بەبینینەوەی گەلێ دڵخۆش بووم. زۆرم لا سەیر بوو کەوتی ئەویش ئەو یەك دوو ڕۆژە، هەر لەو سەربازگەیە دا، لە ژوورێکی تەنیا دانراوە، چونکە لەو ماوەیەدا بەهیچ جۆرێك نەم دەدی.

بەسەر و پوتەڵاکیدا دیار بوو کەمێك ئازار درابێ، ئەویش زۆر هیلاك و ناتەواو دەهاتە پێش چاو. بەتەنیشتمەوە، ئەویشیان بەستەوە. سەرم سووڕمابوو، لە هەڵسوکەوتی لێپرسراوان، لەم سەربازگەیە، نەدەگەیشتم. ئەوا من، بەهۆی عەریفێکی لاوەوە، کە دەیەوێ وانەی ماتماتیکی دا بدەم،

هێنرابووم نێو ڕستورانی سەربازگەکە، ئەی «م» بۆ؟

زۆرم ئەم مەسەلەیە تاووتوێ کرد، بەڵام هیچ نەگەیشتمە ئەنجامێکی بنجبڕ، بۆیە لە «م» پرسی:

«لە تورکیا خەڵك لە ڕستۆراندا زیندانی دەکەن؟»

«م» سەری بادا و زەردەخەنەیەکی سارد گرتی و وتی:

«نەخێر ئێرە سەربازگەیە و زیندانی تێدا نییە، زیندان لە نێو شارە»

پاشان بەدرێژی بۆی باس کردم، کە مەسەلەکە من بووم، منیان بەیاخی بوو لە قەڵەم دابوو، گەرنا یەکسەر تەسلیمی پۆلیسیان دەکردم، وەك کابرایەك، کە بەقاچاغ، سنووری بڕی بێ معامەلەیان لەگەڵدا دەکردم.

«م» کەوتە باسی خۆی، چییان لێ پرسیوە و ئەم چی وتووە و بەگشتی، لە ڕاستیدا زۆر بەوردی، هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە و ئەوەشی پێ وتم کە هیچ باسی ئەوەی نەکردووە کە ئەو دەلیلم بووە و ئەویش بەڕێکەوت لەو ئوتومبێلەدا سوار بووە و هیچی تر.

لە ڕاستیدا، منیش، هەروام وتبوو، بۆیە پێم وت؛ کە هیچ نیگەران نەبێ. «م» دەربارەی داهاتووی من زۆر دڵخورت بوو، چونکە وتی:

«ئەم تورکانە نیازیان، لەگەڵتدا، زۆر خراپە»

گومانم لەوە نەبوو، بەڵام دەسەڵاتم چی بوو؟ بۆیە بە«م»م وت:

«باشە ئەی چی بکەم؟ چار؟»

«م» سەیرێکی پاسەوانەکانی کرد کە چەند مەترێك لێمانەوە دوور بوون، وتی:

«با هەوڵی ڕاکردن بدەین»

خەریك بوو بدەمە قاقای پێکەنین، ڕاکردنی چی؟ هەردووکمان کەلەپچە کرابووین و سەرەڕای ئەوەش، بەزنجیر، بەشۆڤاجی ڕستۆرانەکەوە بەسترابووینەوە، ئیتر ڕاکردن مانای چی بوو؟

لەساویلکەیی «م» سەرم سووڕما، بەڵام لێم پرسی:

«باشە تۆ بۆ؟»

بەگومانەوە لە پاسەوانەکەی دەڕوانی و زۆر بەئەسپایی وتی:

«چۆن بەتەنیا بەجێت دەهێڵم»

بیرکردنەوە، لەو وەزعەی ئێمەدا، لە ڕاکردن هەر تەنیا خەیاڵ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵوێستی سادەی «م» گەلێك دڵشادی کردم کە ئەو، لەو کاتە ناسکەدا، داهاتووی خۆی بەمنەوە گرێ بدا.

ئەوە لە کاتێکدا هیوای ڕزگاربوونی خۆی هێندە زەحمەت نەبوو، چونکە ئەو نە قاچاغ بوو نە هیچی لەسەر بوو، هەروەك هاوولاتییەکی تورکیش بوو. ئەو هەڵوێستەی هەر جوامێری و پیاوەتی نیشان دەدا.

ئەو دوای نیوەڕۆیە «م» هەر باسی ڕاکردنی دەکرد و زۆریش بەجیدی بوو، لای ئەو وابوو گەر کەلەپچەکانمان بکردایەتەوە ئیتر کارەکەمان یەکجار ئاسان دەبوو، کە لە ڕاستیدا وانەبوو، چونکە بەتەنیا کردنەوەی کەلەپچەکان هەموو شتێك جێبەجێ نەدەبوو. ئێمە هیچمان دەربارەی سەربازگەکە نەدەزانی، لەوە زیاتر کە لە دەرەوەی شاری «گەڤەرە»، کە ئەوەش زانیارییەکی هێندە بەبایەخ نەبوو.

«م» پلانێکی زۆر سادەی بۆ باسکردم. ئەم دەیوت: گەر بتوانین کەلەپچەکان بشکێنین! نەمدەزانی چۆن؟ ئیتر لە پەنجەرەکانەوە دەتوانین ڕابکەین!

لەوە دەچوو ئەو قسانە هەر بۆ دڵخۆشیی من بکات، چونکە لەو بڕوایەدا

نەبووم- ئەو خۆی کە پیاوێکی کەم ئەزموون نەبوو- بڕوای بەپیلانی وا زارۆکانە بێ. ئەو قسانە هەر دڵنەوایی بوون و دەرخستنی هەستی دڵسۆزی و نارەحەتیی خۆی بوو. لام وابوو هۆی گرتنی منی دەخستە ئەستۆی خۆی، کە لە ڕاستیدا هیچ گوناهی ئەوی تیا نەبوو.

من، لەلای خۆمەوە، مەسەلەی کردنەوەی کەلەپچەکانم زۆر بەزەحمەت نەدەزانی چونکە، لە کاتی داخستنەوەیدا هەستم کردبوو گەر مەچەك هەڵبەستێنم، ئەوا یەك دوو گرێ فراوانتر دەبێ و کاتی خاوکردنەوەی مەچەکم کەلەپچەکان شل دەبوون، ئەوی دەستی چەپم، بەئاسانی لە مەچەکم بۆ دادەماڵدرا. کەلەپچەکان ئەمریکی بوون، لەوانەبوون کە دانەکانیان دەگەیشتە دوایین گرێی، ئیتر خۆیان دەکرایەوە.

ئەوانەم هەموو بۆ «م» باس کرد و پێم وت:

«گەر مەسەلە هاتە سەر کەلەپچەکان، ئەوە لەسەر من!»

پاشان ئەوەشم فێرکرد کە مەچەکی چی لێ بکات.

ئەو شەوە، داوای نانخواردن، سەربازەکان جارێکی تر، لە دەورمان گردبوونەوە، ئەمجارەیان بەهۆی «م»ەوە کە ڕۆڵی تەرجومانی دەگێڕا، بەتەواوی، لە یەکتر دەگەیشتین. سەربازەکان، تا ڕادەیەك، دۆستایەتیی خۆیان نیشان دەدایین. لەوە دەچوو هەر هێنانمان بۆ هۆڵی نانخواردنەکەیان مەسەلەکانی برێك لە بەرچاویان هێور کردبێتەوە. لە ڕاستیدا پاسەوانەکانیش، وەکو پێشوو، توندوتیژ نەبوون، هەندێ جار بۆ، چەند کاتژمێرێك، کەلەپچەکانیان دەکردینەوە کە دەقا و دەق پێچەوانەی فەرمانی ئەفسەرەکیان بوو کە تەنیا لە کاتی نانخواردن و سەرئاودەستدا بکرێنەوە.

ڕۆژی دوایی دوو سەربازی نوێ هاتن و زنجیرەکەی «م»یان کردەوە، لە سەرەتا دا هیچ تێ نەگەیشتم، پاشان برێ قسەیان لەگەڵ «م» دا کرد و ئەویش بەمنی وت:

«بۆ دادگام دەبەن»

«گەر نەگەڕایتەوە، یان بەربووی، هەواڵی گرتنی من بۆ ئەودیو بنێرە»

سەری ڕاوەشاند و کاتێك لە دەرگای هۆڵەکە چووە دەرێ، ئاوڕێکی لێ دامەوە و هەردوو دەستە کەلەپچەکراوەکانی بەرز کردەوە و بەرامبەرم ڕای وەشاند کە مانای خۆڕاگرتن و سەرکەوتن دەبەخشن. یەکێك لە سەربازەکان، تا توانیی، قۆناغە تفەنگێکی لە ناوشانی سرەواند.

بەجێ هێشتنی «م» ،گەلێك نارەحەتی کردم، هەرچەند لەلایەك پێم خۆش بوو، چونکە بەبەربوونی هەر نەبووایە هەواڵێکی منی بەدیوی خۆمان دەگەیاند.

بەتەنیا مانەوەم هەستی بۆ لای قسەکانی «م» دەبردم، لە ڕاستیدا منیش کەوتبوومە ئەوەی بیر لە ڕاکردن بکەمەوە و پیلانێك دابنێم، بەجۆرێك لەم تەڵەیە خۆم ڕزگار بکەم، بەڵام هەرچیم بیرکردەوە مەحاڵ بوو.

لە سەربازگەکەدا چل سەرباز هەمیشە لەم بینایەی مندا بوون، پاسەوانی هەمیشەییم هەبوو، هەروەك دەستم کەلەپچەکراو و سەرەڕای ئەوەش بەزنجیر بەشۆڤاجێکەوە بەسترابووم.

ئەگەرچی مەسەلەی کردنەوەی کەلەپچەی دەستم تا ڕادەیەك ئاسان بوو، بەڵام ئەوەشی دەویست کە جارێك لە جاران یەکێ لە پاسەوانەکان دەبووایە کەلەپچەکەم تۆزێ شل بۆ ببەستێ تا بتوانم بەئاسانی لە مەچەکمی دابماڵم.

ئێوارەیەك بردمیانە ژوورەکەی پێشووم، ئەمجارەیان دوو کورسی لە ژوورەکەدا دانرابوون، زۆر سەرم سووڕما و لە نهێنیی هێنانەوەم و لەو دوو کورسییە نەدەگەیشتم، من هەر لە تاووتوێی ئەوەدا بووم کە پیاوێکی پۆشتە و پەرداخ خۆی کرد بەژوورەکەمدا و بەئینگلیزییەکی ڕەوان سڵاوی

لێ کردم و لەسەر یەکێك لە کورسییەکان دانیشت و پاشان ئیشارەتی بۆ منیش کرد کە لەسەر کورسییەکەی بەرامبەری دابنیشم.

کابرا خۆی پێشکەش نەکرد و تەنیا وتی؛ کە بیستوویەتی عێراقییەکەم و تورکی نازانم، بۆیە ئەویش هاتووە بۆ سەردانم، کاتێك منیش پرسیارم کرد کە ئەو چ کارەیە لە وەڵامدا زۆر بەکورتی وتی:

«ئەوە گرنگ نییە»

دیار بوو یا پۆلیسی نهێنی بوو، یا لێپرسراوی گەورەی دەوڵەت بوو. بەڵام بۆ هاتبوو بۆ سەردانم؟.

کابرا کەوتە قسەکردن و پرسیارکرد کە چۆن هاتووم، بۆچی هاتووم و چۆن بەبێ فیزە هاتوومەتە نێو تورکیاوە و گەلێ پرسیاری تریش کە هەر هەمووی نموونەی کاری نهێنی و بۆنی دژایەتی و ڕق و کینەی، دەربارەم، لێ دەهات. لە نێوان پرسیارەکانیدا، زۆر بەزوویی، بۆم دەرکەوت کە یەکجار کۆنە پەرست و زۆر ڕقیشی لە کوردە، کابرا بەقەشمەرییەوە وتی:

«نازانم خەڵکی ئەم شارە چین، کە بەیانیان لە ماڵەکەم دێمە دەرێ لەسەر دیواری ماڵەکەم دەنووسن؛ بیجی کوردستان. نازانم کوردستان چییە؟»

دیارە، بیجی کوردستان، مەبەستیان بژی کوردستان بوو کە لەسەر دیواری ماڵەکەی نووسرابوو. بەفرسەتم زانی، وەك شیکردنەوەیەك وتم:

کوردستان وەك تورکستان، ئەفغانستان و ئینگلستان، وڵاتە و کوردستانیش یانی وڵاتی کوردان»

کابرا سەری نا ڕەزایی ڕاوەشاند و بەتوورەیییەوە وتی:

– شتی وا نییە. ئەم وڵاتە هەر تەنیا هی تورکە، لەم وڵاتە تەنیا تورك دەژی.

زۆرم دەربارەی شۆڤێنیەتی دەسەڵاتدارانی تورکیا بیستبوو بەڵام هەرگیز وا ڕووبەڕووی کەسێك نەبوو بووم کەوا کەللەپووتانە، بڵێ کوردستان وجوودی نییە، بۆیە لە وڵامیدا وتم:

«لێرە تەنیا نە تەنیا تورك بەڵکو، کورد و عەرەب، ئەرمەن و گەلێك کەمە نەتەوایەتیی تریش دەژین»

ئەم وەڵامەم ئەوەندەی تری تووڕەکرد، سوور هەڵگەڕا و نازانم چۆن بۆم هەڵنەسا.

کابرای بەرامبەرم بۆیناخەکەی ملی، بڕێك، توند کردەوە و وتی:

«ئێوە لە دەوڵەتەکەی خۆتان کە عێراقە یاخین، چەندین ساڵە خەریکی ئاژاوەن. ئێستا دەتانەوێ ئاژاوە بێننە ناو خاکی ئێمەشەوە و تورکیاش وەك عێراق لێ بکەن!»

وتووێژی نێوانمان بێ بەر بوو، ئەو لە دیدی تەسکی شۆڤێنەتی تورکییەوە و منیش لە دیدی پێشمەرگەیەکی شۆڕشگێڕەوە، دوو قوتبی دژ بەیەك بووین، لەگەڵ ئەوەشدا باسی ئەوەم بۆ کرد کە ئێمە یاخی نین و لە پێناو مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤدا دەجەنگین و لە وەڵامی ئەو داوا ڕەوایانەشدا هەمیشە سەرکوت و ماڵوێران و تووشی کوشتن و بڕین دەبین.

کابرا چەند پرسیارێکی تری لێ کردم کە لە ڕاستیدا نەبلەقی کردم، ئەو دەیوت؛ گوایە من نێراوم بۆ تورکیا بۆ ئەوەی کوردەکانی ئەوێ، دژی حکوومەتی تورکی، مان بدەم، هاوکات چەك و تفاقی جەنگیش لەو سۆڤیتەوە بێنم!

بەڕاستی زانیاریەکان بێ سەروبەر بوون. زۆر وتووێژی ترمان کرد، کابرا هەریاری سەرنجی خۆی دا دەسەپاند و هیچ گوێی نەدەدایە قسەکانی من.

من پێم وت کە مەسەلەی بەرپاکردنی شۆڕش و ڕاپەڕین خەڵك بەکەسێکی لە دەرەوە هێنراو ناکرێ، هاوردنی چەکیش لە یەکێتیی سۆڤیەتەوە- گوایە من خەریکی بم لە خەیاڵی پەتیی بەولاوە هیچی تر نابێ. بەڵام ئەو گوێی لە قسەکانم دەگرت؟

کابرا، کە لەمەودوا زانیم، قائیمقامی شاری «گەڤەر» بوو، بەتەکلیفی سازمانی ئەمنیەتی تورکی «میت»، نێردرابووە لام، چونکە لای «میت» وابوو گەر کەسێك ئینگلیزی بزانێ و لە شاخ و کێوەوە هاتبێ دەبێ زۆر شتی شاراوە لە ژێر سەریدا بێ!.

پاش تەواو بوونی چاو پێکەوتنەکە، هێنامیانەوە شوێنەکەی خۆم و جارێکی تر بەزنجیر بەستمیانەوە.

ئەو شەوە هەر لە خەیاڵی ئەوەدا بووم، کە بۆچی قائیمقامی شاریان ناردووەتە لام. من ترسی ئەوەم لێ نیشتبوو، کە مەسەلەکە هێندە گەورە کرابێ، کە تووشی بەندیخانەکانی ئەستەمبۆڵ و ئەنقەرە بم. سەربازەکان، ئەو شەوە، زۆر بەتاسوقەوە دەوریان دام، زۆریان لا سەیر بووکە قائیمقامی شارەکایان، بۆلای زیندانییەك، بۆ چاوپێکەوتن، هاتبێ!.

زۆربەیان پرسیاری ئەوەیان لێ دەکردم کە بۆ قائیمقام هاتووە بۆ دیدارم.

لە ڕاستیدا منیش هیچ وەڵامێکی ڕوون و بەجێم پێ نەبوو. بەڵام وتم:

«دیارە لەم شارەدا تەنیا ئەو ئینگلیزی دەزانێ بۆیە هانیویانە!»

نازانم ڕاستی ئەو بۆچوونەم چەند بوو، بەڵام لەوە زیاتریشم پێ نەبوو، چونکە خۆشم هاتنی قائیمقامی شارم بۆ چارەسەر نەدەکرا.

پاسەوانی «دە» بۆ «دوانزە»ی ئەوشەوە کوڕێکی باریکەلەی چاوشین بوو، سەر و هەیئەتی لە تورك نە دەچوو، هەمیشە لە کاتی پاسەوانیدا سۆز و بەزەیی و دڵناخۆشیی خۆی لە سەرە پاسەوانیدا، نیشان دەدام.

ئەگەرچی تەنیا چەند وشەیەکی ئینگلیزیشی دەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا، توانی ئەوەندەشم تێ بگەینێ کە دایکی بوڵگارییە و خۆشی بەچەپ دەزانی.

دیارە زۆر قسەی تریشی کرد کە من بەڕاستی هیچی لێ تێ نەگەیشتم. بەهەڵسوکەوت و ڕەفتاری لەگەڵمدا، نارەزایی خۆیی لە گرتنم نیشان دەدا. لە کاتی تەواو بوونی سەرە پاسەوانیدا، کەلەپچە مەچەکی هێند بۆ شل کردمەوە کە بەئاسانی بتوانم لە دەستمی دەربهێنم و ئەوەندەشی تێ گەیاندم کە هەرچی ڕوویدا، هیوادارە، لە سەرە پاسەوانیی ئەودا ڕوونەدا.

ئەگەرچی خۆشم دەمتوانی کەلەپچەکان بکەمەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر پێ خۆشحاڵیی خۆم دەربڕی و زۆریش سوپاسم کرد و چەندین جار «چۆق مەمنوون»م کە هەر سوپاسی دەگەیاند، پێشکەش کرد.

ئەو شەوە، تا درەنگ، هەر بەئاگا بووم، بیرم بۆلای پلانێکی ئەوتۆ نەدەچوو، کە لام وابێ، سەرکەوتنی تێدا بەدەست دەهێنم.

پاسەوانەکان هەر دوو سەعات جارێك دەگۆڕان، بیرم زۆر کردەوە، بەڵام هەرچیم بەخەیاڵدا دەهات هەر بێ مانا و ناسەرکەوتوو دەهاتە پێش چاو. لە دڵی خۆمدا وتم:

«کەلەپچەکان بەئاسانی لە دەستم دەردەهێنم» و "دەتوانم پەلاماری پاسەوانەکە بدەم". ئەی دوایی؟»

بیر لە دوایی، دەستی دەبەستم و هەموو بیرکردنەوەیەکی لەو بابەتەی لا ڕەت دەکردمەوە، بۆیە بەتانییەکەم دا بەسەرخۆمدا و لە ژێرەوە کەلەپچەکانم داکەند و لێی خەوتم.

ڕۆژی دوایی، لە دەمەو عەسردا، دوو سەرباز هاتن بەشوێنمدا و بردمیانە ژوورێکەوە.

چەند کەسێك لە ژوورەکەدا، بەجلی مەدەنییەوە، لەسەر کورسی، بەچواردەوری ژوورەکەدا، دانیشتبوون و کورسییەکیش لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دانرابوو کە لەمەوپاش من لەسەری دانیشتم.

ئەوەی هەر لە سەرەتاوە، لام سەیر بوو، یەکێك لە پیاوەکان بوو کە بەکوردییەکی تەواو پێشوازیی لێ کردم و داوای دانیشتنی لێ کردم.

پیاوەکانی تر لام نا ئاشنابوون. لە ڕاستیدا، لە سەرەتادا، سەرم لە هاتنی ئەم پیاوانە بەجلی مەدەنییەوە، بۆ نێو سەربازگەیەك، دەرنەدەچوو.

بەڵام زۆری نەبرد کە لە نهێنی هاتنی ئەو پیاوانە حاڵی بووم، ئەوانە هەموویان پیاوانی (میت) بوون و کوردیزانەکەش تەرجومانی تایبەتی خۆیان بوو. کەوتنە پرسیارکردن لێم، هەر لە مێژووی لە دایك بوونمەوە تا ئەوساتەی گەیشتوومەتە لای ئەوان. پرسیارەکان جۆراوجۆر بوون هەر لە باسی منداڵیمەوە تا خوێندن و بەشداری لە بزووتنەوەی کوردا تا دەگاتە ناوی برادەرە نزیکەکانم، ئەوانیش کەوتنە بەر شاڵاوی پرسیاریان، دیار بوو زۆر تامەزرۆی ناسینم بوون!

ئەوەی بەلای (میتەوە) گرنگ بوو، دوو بابەتی سەرەکی بوو، هەمان دوو بابەت کە قائیمقامی شارەکەیان مەبەستی بوو، ئەویش مەسەلەی بەرپاکردنی شۆڕش لە کوردستانی تورکیا و هاوردنی چەك لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بوو! بۆ مەسەلەی بەرپاکردنی شۆڕش لە کوردستانی تورکیا، دیارە جارێکی تر بۆ ئەمانیشم باس کرد، کە شۆڕش وەك کاڵا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر نانێردرێ و زەمینەی زاتی و مەوزوعیی ڕەخسا و کامڵبوونی خۆی دەوێ، بەڵام ئەوان هەر سووربوون، لەسەر ئەوەی کە دەبێ من بەکارێکی نهێنی نێردرابم، چونکە خەڵکی ئاسایی، بەنیوەشەو، بەنهێنی، بێ فیزە، بەو سنوورانەدا تێ ناپەڕێ و ئەو هەموو کاغەز و نووسرا و وێنە و پاسەپۆرتە بێ فیزەیە و ئەو هەموو پارەیە لەگەڵ خۆیدا هەڵناگرێ.

دوو بابەت ئەوانی تەواو خستبووە گومانەوە لێم، یەکەم، ئەو مەبلەغەی پێم بوو، کە بریتی بوو لە (٥٠٠) دیناری عێراقی! کە پارەیەکی ئەوتۆ نەبوو لای خۆمان، بەڵام کاتێك بەپارەی بێ ئەرزشی خۆیان، بەراورد دەکرد، هەر فیکەیان لێ دەدا و سەریان سووڕدەما! ئەوەش ئەوانی خستبووە ئەو قەناعەتەی کە من ئەو پارەیەم لەگەڵ خۆمدا هێناوە هەر دەبێ بۆ کڕینی چەك بێ.

دووەم، نامەیەك بوو کە بۆ یەکێك لە لێپرسراوانی باڵای دەوڵەتی سووری نووسرابوو. ئەوەش هەر تەواو پێی سەلماندبوون کە من بەئەرکێکی تایبەتی هاتبوومە نێو تورکیا و بەمەبەستێکی شاراوە بۆ سووریا دەچم.

یەکێك لە پیاوەکان زۆر بەساویلکەییەوە لێی پرسیم:

«باشە هەردووك ڕژێمی عێراقی و ڕژێمی سووری بەعسین، بۆ ئێوە دژی عیراق و لەگەڵ سووریادا کۆکن؟»

لە ڕاستیدا وەڵامیکی بەجێم پێ نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ کە یەکەمیان دژایەتی و سەرکوتمان دەکات و دووەمیان دۆستایەتی، نازانم وەڵامەکەم قەناعەت ئاوەر بوو یان نا، چونکە زەردەخەنەیەکی مەسخەرەئامێز گرتی و هیچی نەوت.

بۆ مەسەلەی هاوردنی چەکیش، لە سۆڤیەتەوە، دیارە ئەوان لە گوێی گادا نووستبوون، چونکە چەك لە سۆڤیەتەوە نە دەهات، بەڵکو لە ڕێی سووریەوە و بەخاکی تورکیادا دەگەیاندرایە کوردستان و خۆشم لە هاوردنی وەجبەی یەکەم و دووەمی هێنانی چەکدا، بەشداریم کردبوو، کە خۆشبەختانە، ئەوان هیچ زانیارییەکیان، دەربارەی ئەو مەسەلەیە، نەبوو. لای (میت) و دەسەڵاتدارە کۆنەپەرستە عەسکەرییەکانی تورکیا بۆ مەبەستی خۆیان و خۆ بردنە پێشەوەی زیاتر لە ئەمەریکا و هاوپەیمانییەتی (ناتۆ) هەموو

جموجوڵێکی شۆڕشگێڕانەی کورد، تەنانەت گەر داوای سادەی پێشێل نەکردنی مافی مرۆڤیش بوایە، ببەستنەوە بەیەکێتیی سۆڤیەتەوە و بەگیرە شێوێنی لە قەڵەم بدەن! دیارە ئەوەش لە پێناو ئەوەدا بوو، کە ئەمەریکا، زیاتر بایەخ بەگرنگیی تورکیا و میلتاریزمی تورکیا بدات.

پیاوێکی تریان سمێل بابرێکی باریکی ڕێوەڵە بوو، دەربارەی ئەوەی کە چۆن حکوومەتی عێراق ناتوانێ بەسەر کوردە شۆڕشگێڕەکاندا– ئەو دەیوت یاخییەکان– زاڵ بێت، پرسیاری لێ کردم و منیش لە وەڵامدا پێم وت؛ کە مەسەلە زاڵ بوون نییە، چونکە ئەگەر لە ڕووی چەك و تەقەمەنی و تەکنیکی تازەی عەسکەرییەوە بێت، ئەوە ڕژێمی عێراق زۆر زاڵە، بەڵام لە ڕووی بڕواوە زۆر لاوازە، سەربازەکان بڕوایان بەو شەڕە نییە و بەزۆرە ملی بۆ کوردستانیان کێش دەکەن، هەروەك هێزی پێشمەرگەش داکۆکی و بەرگری لە ماف و وجوودی گەلەکەمان بەتەواوی دەکات و شەڕەکەش شەڕێکە لە نێوان هەق و ناهەق، شەڕێکی کە بەزۆر بەسەر گەلێکی بەستەزماندا داسەپێنراوە و ناچار کراوە بیکا، بۆیە مان و نەمانی بەندە بەو بەرەنگارییەوە و نەکردنی ئەو شەڕەش هەڕەشە لە بوونی دەکات.

دەربارەی تەکنیکی تازەی عەسکەریی عێراقیش پێم، وتن، کە هەرگیز توانای عێراق پتر لە توانای ئەمەریکا نابێ و خۆشتان بەچاوی خۆتان دیتان کە گەلێ ڤێتنامی ئەمەریکای بەچ دەردێك برد و چۆن بەسەرشۆڕی لە خاکی ڤیتنام دەری پەڕاندن، ئەوە لە کاتێکدا کە هەموو دنیاش دەیزانی گەلی ڤێتنامی دووچاری شەڕێکی نا بەرامبەر بووە، بەڵام بڕوای گەلی ڤێتنام و ڕەوایی مەسەلەکەی وەك دەرکەوت، گەلێ بەهێزتر بوو لە شەڕی کیماوی و(ب–٥٢)ی ئەمەریکا.

کابرای ڕیوەلە دیار بوو. بەقسەکانم زۆر پەست بوو، چونکە بەتوندی بەپەنجەکانی سمێڵە ڕەشە قەترانییە پڕەکەی ڕادەکێشا، زەردەخەنەیەکی

تەوساوی هاتە سەر لێوە وشکەکانی و بە نارەزاییەوە سەری ڕاوەشاند.

پیاوەکان، لە ناو خۆیاندا، پێکەوە، کەوتنە مقۆ مقۆ، پاش ساتێ، یەکێکیان کە خڕەڵەیەکی ورگ زل بوو لە ناوەڕاستیاندا دانیشت بوو، وتی:

«بەهەرحاڵ تۆ کابرایەکی یاسا شکێن و گێرە شوێن و یاخیت لە دەوڵەت»

ئەمەی وت و یەکسەر کەوتەوە قسەکردن لەگەڵ پیاوەکانی تردا و پاشان بۆ ماوەیەك تێی ڕوانیم وتی!

«لێپرسینەوەی ئەمڕۆ تەواو،

بڕۆ دەرێ!»

کاتێ چوومە دەرێ پاسەوانەکان چاوەڕوانم بوون و ڕاستەوخۆ بردمیانەوە ژوورەکەی پێشووی خۆم.

لە سووچی هۆڵەکەدا هەڵترووشکام، بیرم لە قسەکانی کابرای خڕەلە دەکردەوە، وتەکانی لە گوێمدا دەزرنگانەوە کە دەیوت:

– تۆ یاسا شکێنی و گێرە شوێن و یاخیت لە دەوڵەت.

لە دڵی خۆمدا دەموت لە وڵاتێکی وا شۆڤێنی و میلیتاریستی وەك تورکیا، دەبێ یاسای سزای یاسا شکێنێ و یاخی لە دەوڵەت چی بێ؟ ئەوان کە لەسەر پۆشینی جلی کوردی خەڵکی تووشی ئازار و ئەشکەنجە و زیندان بکەن، ئەی لەسەر یاسا شکێن و گێرەشێوێن و یاخی بوون لە دەوڵەت! دەبێ چی بکەن؟

ئەو ئێوارەیە، هەر بیرم لای قسەکانی پیاوانی (میت) بوو، بەتەواوی هەستم دەکرد کە تەواو نیازیان گڵاوە بەرامبەرم، لە دڵی خۆمدا دەموت، تۆ بڵێی خۆیان دادگا و سزام بدەن؟ یا تۆ بڵێ ڕەوانەی عێراقم بکەنەوە. هەموو شتێکم بەخەیاڵدا دەهات، بۆیە هەر ئەو ئێوارەیە بیرم لە زۆر شت

دەکردەوە، وەکو، ئەگەر هاتوو، دەستم گەیشتە تفەنگێ ئەوا یەکسەر پەلاماری دەدەم و تەقە دەکەم، یا کەلەپچەکان، شەو دەکەمەوە و هەوڵی ڕاکردن دەدەم، یا ئەگەر هەر هیچم بۆ نەکرا، ئەوا هەوڵی خۆکوشتن دەدەم، چونکە بەڕاستی مەسەلەی ڕەوانەکردنەوە بۆ عێراق، هەموو ئازار و یادە تاڵ و سەختەکانی زیندانی (هەیئەی کەرکووک)ی دەخستەوە یادم و بەتەواوی گێژی دەکردم، بۆیە مەسەلەی تەسلیم کردنەوەم بەعێراق وەك گەورەترین و ترسناکترین شت دەهاتە بەرچاو.

شەو هەندێ لە سەربازەکان هاتنە سەردانم، بەڵام من زۆر بێ حەواس بووم، بۆیە هەر زوو پێم وتن کە ناساغم و سەرم دیشێ و حەزیش دەکەم زوو بنووم.

هەر بەڕۆیشتنی سەربازەکان، خۆم خزاندە ژێر بەتانییەکەوە و چاوم لێ نووقان، ویستم بنووم، بەڵام بەهیچ شێوەیەك خەو نەدەچووە چاوم.

کاتژمێر دوانزە کارەبای سەرتاسەری سەربازگەکە کوژێنرایەوە، شەوانە چەند سەعاتێك، گڵۆپەکانی سەربازگەکەیان دەکوژاندەوە، نەمدەزانی بۆ.

پاسەوانی دوانزە بۆ دوو، بەچرایەك و تفەنگێکەوە خۆی کرد بەهۆڵەکەدا، لە سەرەتادا چەند ورتەیەکی کرد کە هیچی لێ حاڵی نەبووم و منیش یەکسەر دەستم کرد، بەپرخە پرخ، سەرباز کە یەك دووجار هاتە نزیك جێگاکەم و چراکەی لە دەم و چاوم نزیك دەکردەوە و منیش زیاتر پرخە پرخم دەکرد. سەربازەکە، کە دیار بوو، زۆر خەواڵویوو، چووە نزیك مێزێك و چراکەی لە بەردەمیدا دانا، هەر بەدانیشتنەوە چەند جارێك لەتر دا و خۆی بەئانیشکی دەگرتەوە. من چاوم بەحاڵ هەڵبڕی و سەیری سەربازکەم کرد، ورده ورده سەری نزیك دەکردەوە بۆ سەر مێزەکە و لە پڕێکدا یەکسەر سەری خستە سەر هەردوو دەستی و پاش ماوەیەك، ئەویش کەوتە پرخە پرخ.

وەختم هیچ لە کیس خۆم نەدا و بە ئەسپایی کەلەپچەکانم لە دەستم

داکەند و زۆریش هەوڵم دا کە زنجیرەکە هیچ زرەی نەیە، بۆیە بەتانییەکەم بەتەواوی تێوەپێچا و لە تەنیشت شوفاجەکەوە گلۆڵەم کرد. سەبازەکە هەر پرخەی بوو، شەوقی چراکەش کە دەیدا لە سەر و پۆتەلاکی سێبەرێکی یەکجار زەبەلاح و ترسناکی لەسەر دیوارەکەی پشتیەوە دروست دەکرد.

من لە سووچێکی هۆڵەکەدا هەستابوومە سەر چیچکان، شوێنەکەم بە حاڵ ڕووناکیی چراکە دەیگرتەوە و تا ڕادەیەکی باشیش تاریکی باڵی کێشابوو بەو سەرسووچەی کەمنی تیا بووم، ویستم هەستمە سەرپێ، کە چراکە کەوتە پرتەپرت و سێبەرە گەورەکەش لەسەر دیوارەکە کەوتە لەرانەوە، بۆ ماوەیەك هەناسەم لە خۆم بڕی و پاشان هەستامە سەرپێ و زۆر بەئەسپایی، ڕووەو دەرگای هۆڵەکە، شەقاوم نا، دەرگای هۆڵەکە دانەخرابوو، بۆیە زۆربە ئەسپایی کردمەوە چوومە ناو ڕاڕەوەکەوە، لە پێشدا نەمزانی ڕووبکەمە کوێ بۆیە بۆ ماوەیەك بەچوار دەوری خۆمدا تیم ڕوانی، ڕاڕەوەکە تەواو تاریك بوو، وردە وردە بەلای چەپدا ڕووە دەرگای دەرەوە، لەسەر نووکی پێ، هەنگاوم هەڵدەهێنایەوە، کاتێ گەیشتمە نزیك دەرگای دەرەوە، لە پشتیەوە، بۆ ماوەیەك هەڵوێستەیەکم کرد، بەشی سەرەوەی دەرگاکە شووشە بوو، بۆیە کە تۆزی خۆم هەڵبری بەتەواوی دەرەوەم دی، دنیا مانگەشەوێکی یەکجار ڕووناك بوو، تا چاو بڕکا هەر سەهۆڵ و بەفربوو، دەشتەکەی بەردەمم، لەبەر تریفەی مانگەکە، دەتوت یەکپارچە شووشەیە، بریقە دەداتەوە. هەناسەم تەواو لە خۆم بریبوو، ملم تا توانی درێژکرد، دووسەربازبە تفەنگەوە لەودیو دەرگاکەوە ڕاوەستابوون، بێ ورتە سەیری دەشتەکەی بەردەمیان دەکرد. بۆ ماوەیەك هەر وا ڕاوەستام و پاشان کەوتمە بیرکردنەوە، ویستم یەکسەر دەرگاکە بکەمەوە، ڕابکەم، بەڵام سەهۆڵ بەندانەکەی بەردەمم و ئەوە دەشتە بریقە دارە، پەشیمانی دەکردمەوە. لە ڕاستیدا نەمدەزانی چی بکەم، ڕابکەم کە بێگومان تەقەم لێ دەکەن، بگەڕێمەوە تفەنگی ژێر سەری پاسەوانەکەم بهێنم دیارە ئەویش

بەخەبەر دەهاتەوە و دەبوو بەشەڕ، بیرم لە ڕاکردن جارێکی تر کردەوە بەڵام کە سەیرم کرد بێ پێڵاوم و بەپێی پەتیش ڕۆیشتن و ڕاکردن، بە سەر ئەو سەهۆڵ بەندانەدا بەکارێکی ئاسان نە دەهاتە بەرچاو، یا ڕاستر وایە بڵێم هەر نەشدەکرا، چونکە هیچ مرۆڤێ، بەپێی پەتی بەسەر ئەو سەهۆڵ و بەفرەدا، لە چەند دەقیقەیەك زیاتر، توانای ڕۆیشتنی نەبوو، بۆیە وازم لەو جۆرە ڕاکردنە هێناو بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ جێگاکەی خۆم و بیر لە پلانێکی سەرکەوتووتر بکەمەوە، چونکە ئەوە بەلامەوە تەنیا خۆ کوشتن یا ڕەق بوونەوە بوو.

ورده ورده، لەسەر نووکی پێ، زۆر بە ئەسپایی، هاتمە ناو هۆڵەکە و بەچەند شەقاوێك خۆم گەیاندەوە سەر جێگاکەم و زۆر بە هێمنی بەتانیەکەم لە زنجیرەکە کردەوە و خۆم خزانەوە ژێر بەتانییەکە.

کە ڕاکشامەوە لە دڵی خۆمدا وتم «پیاو کە دەرباز نەبێ، بۆ رابکا؟» سەربازەکە هەر پرخەی دەهات، لەوە دەچوو ڕۆژێکی گەلێك دژواری بەسەر بردبێ، چونکە تا سەرە گۆڕێنی حەراسەت هات و گوێی لە تەقەی پۆستاڵی پاسەوانی داهاتوو نەبوو، لە خەوەکەی ڕانەپەڕی.

بەیانی زوو هەڵیان ساندم و عەریفێك و دوو سەرباز پێکەوە هاتنەلام و پێیان وتم کە پاش نان خواردن خۆم ئامادە بکەم، هیچی تریان نەوت بەڵام من تێ گەیشتم کە دەشێ یا بمگوێزنەوە بۆ شارێکی تر، یا بۆ لێپرسینەوەیەکی تر بێت.

پاش نان خواردن سەربازەکان دەستیان کەلەبچەکردم و پێش خۆیان دام بۆ دەرێ، لەوێ پیکابێك ڕاوەستابوو، عەریفەکە لە پێشەوە سوار بوو، من و دوو سەربازەکەش لە دواوە سوار بووین.

هەتاو تازە، لە دەم کەل شاخەکانی گەڤەڕەوە، سەری دەردەهێنا. ئاسمان شین، وەك دەریایەکی مەنگ و قووڵ دەینواند، بەفر تەواو دەوروبەری

تەنیبووەوە، کزەبایەکی یەکجار سارد دەهات، کە لەسەر کورسییە ئاسنەکان دانیشتم، ئنجا بەتەواوی هەستم بەسەرما کرد، دەتوت لەسەر قالبێك سەهۆڵ دانیشتووم، پیکابەکە ڕووەو شار کەوتە بزوان - هەر بەوەشدا دڵنیابووم کە نامگوێزنەوە بۆ شاری تر، سەربازەکان هەر دووکیان بەرامبەرم دانیشتبوون لەوە نە دەچوو - وەك من - هەست بەو سەرمایە بکەن، جلوبەرگ، چەك و تفاقیان سەرنجی ڕاکێشام. ئەوان بەجۆرێکی سەیر خۆیان سازدابوو، لەوە دەچوو بۆ جەنگێکی ڕاستەقینە ئامادەبن، نەك بەندییەکەی بێ چەك و کەلەبچەکراو، بگەێنن. خودەی پۆڵایین، چەك و تەقەمەنییان، مەتارەو جوعبەی فیشەکی زیادیان، ئەوەندەی تر توندوتیژی بەسەرو پۆتە لاکی شینەوە بۆیان دەگەیاند، ئەوەی کەلە هەموو شتێك زیاتر سەرنجی ڕاکێشام؛ پۆستاڵەکانیان بوو، کە بێ ئەندازە زل و قەبە و ناقۆلابوون، ئەوە سەرەڕای «ژ۳» کانی نێو دەستیان کەمن بۆ یەکەمجارم بوو وا لە نزیکەوە بیانبینم.

هەر لەو ساتەدا بیرم لەوە دەکردەوە کە تۆ بڵێی ئەم سەربازانە بەو جۆرە جلوبەرگ و بەهەموو تەقەمەنی و ئەو تفەنگە قورسانەوە بتوانن شەڕ بکەن، ڕابکەن، یا بەئاسایی خۆیان ببزوێنن.

لەناو شاری گەڤەردا پیکابەکە ڕاوەستا، پەلیان گرتم و دایان بەزاندم و لە بەردەم بینایەکی گەورەدا ڕایان گرتم. هەوڵم دا سەر لەوحەی بیناکە بخوێنمەوە، بەڵام بێ سوود بوو. هیچ حاڵی نەبووم. بردیانمە ژوورەوە و لە دالانێکی سارد و سڕدا، لە بەردەم دەرگایەکدا ڕایان وەستاندم، سەرانسەری ڕاڕەوەکە جگە لە من - کەسی تری لێ نەبوو. عەریفەکە چووە ژوورێکەوە و پاش ساتێك هاتە دەرێ و بەرەو ژوورێکی تر کێشیان کردم. بەپەلە سەر لەوحەی هەموو ژوورەکانم خوێندەوە و هیچیشی لێ حاڵی نەبووم، ویستم لە سەربازەکان بپرسم. بەڵام بە چ زمانێ؟

چەند گەنجێك هاتنە نێو دالانەکەوە و برێ سەرنجی منیان دا بەسەرسوورمانەوە تێیان دەڕوانیم و بەسەرسوورماوییەوە سەیری کەڵەبچەکانی مەچەکمیان دەکرد. لێمان نزیك بوونەوە و لەگەڵ سەربازەکاندا بەتورکی کەوتنە دەمەتەقێ. یەکێك لە گەنجەکان بەکوردی پێی وتم:

«دەزانین مەسەلەکە چییە، ترست نەبێت. هەوڵی ڕزگار کردنت دەدەین!»

وەك لە ئاسمان بەرم دەنەوە. بڕوام نەدەکرد. چی؟ ئای چەند پێ خۆشحاڵ بووم، بۆیە منیش زۆر بە پەلە تێم گەیاندن کە پێشمەرگەم و مەترسیی گەورەشم ئەوەیە کە تەسلیمی عێراقم بکەنەوە، بۆیە پێم وتن:

– هەرچی دەکرێ بەقوربانە با زوو بکرێ، ئەگەرنا لە دەست دەچێت.

یەکێك لە گەنجەکان، کە چوار شانەیەکی باڵا کورت بوو، تێی گەیاندم کە ئەو شوێنە «دادگای مەدەنی»یە.

ئێمە سەرگەرمی قسەکردن بووین کە عەریفەکە لە ژوور هاتە دەرێ و زۆر بە توندی بە سەرباز و گەنجەکاندا هەڵشاخی، لەوە دەچوو، هەر لە ژوورەوە گوێی لە قسەکان بوویێت، چونکە یەك دوو پاڵی بە گەنجەکانەوەنا و لەو ناوە دەری پەڕاندن.

عەریفەکە قۆڵی بەتوندی گرتم و کردمی بەژووردا. لەوێ دوو پیاو دانیشتبوو، یەکێکیان بەرگی دادوەریی پۆشی بوو، من ئەو جۆرە جلانەم تەنیا لە فلیمدا دی بوو، عەبایەکی ڕەشی قەترانی و قژێکی سپیی دەستکرد، زۆر سەرنجی ڕاکێشام و وامدەزانی – لەو ساتەدا – بینەری شانۆگەرییەکم، دۆلابی پشتەوەی دادوەر یەکپارچە کتێبی بەرگ تازەو ئەستوور بوون. پیاوەکەی تر لای شانی ڕاستی، دادوەرەوە دانیشت بوو، یەکسەر بە کوردییەکی ڕێکوپەوان خۆی پێشکەش کردو وتی:

«تەرجومانم!»

دادوەر کوڕێکی گەنج بوو، سەر و هەیئەتی ئەو ڕق و کینەیەی تیا هەست پێ نە دەکرا، کە لە زۆربەی زۆری کاربەدەستان و دەسەلاتدارانی تورکیا بەدی دەکرێت. زۆر بەهێمنی و لەسەرخۆ فایلەکەمی تاوتۆی دەکرد و پاشان زۆر بەهێواشی وتی:

«تۆ هیچت لەسەر نییە! تەنیا ئەوە نەبێ کە بەبێ فیزە هاتوویتە نێو خاکمانەوە و کارێکی نایاساییت کردووە»

کەمێك ڕاوەستا و پاشان سەیری کردم و وتی:

«بۆیە دەبێ بۆ ماوەی (١٥) ڕۆژ بچیتە ناو زیندانی مەدەنیەوە، تا ڕۆژی دادگاییت»، ئەمەی وت و فایلەکەی داخست و لەگەڵ تەرجومانەکەدا کەوتە چرپەچرپ.

تەرجومانەکە پێی وتم:

«تا ڕۆژی دادگا لە زیندانی «گەڤەر» دەبێت چاوەڕێ بیت»

پاش تۆزێك تەرجومانەکە پێی گوتم!

«مەسەلەکەت هێندە گران نییە، نیگەران مەبە!!»

گاڵتەم بەئەقڵی تەرجومانەکە دەهات. منی پێشمەرگە، قاچاغ لە عێراق، سنوور بشکێنم، بێ فیزە، بێمە ناو تورکیا و کۆماندۆی تورکی، لە نیوە شەودا کەمینێکی نهێنیم بۆ دابنێ و دەستگیرم کات، هێشتا نیگەرانیش نەبم! وای لەو ئەقڵە.

تیشکی هەتاو، لە درزی پەردەکانی لای شانی چەپی دادوەرەوە، دەیدا بەسەر شووشەی مێزی دادوەردا و بریسکەی ئاوی چاوی دەبرد، ویستم پرسیار لە دادوەر بکەم کە ئەو بەزەنگێك، عەریفەکەی هێنایە ژوورێ و چەند وشەیەکی لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ کرد و عەریفەکەش بەسەر ئیشارەتی بۆ کردم کە لەگەڵیدا بچمە دەرێ. کە هاتینە دەرێ، چاوم بۆ کوڕە گەنجەکان

گێڕا، بەڵام جگە لە سەبازەکان کەسی دیم، بەدی نەکرد.

سەربازەکان، کەلەپچەکەیان کردەوە دەستم، بەداڵانە سارد و سڕەکەدا ،پێش خۆیان دام.

لە نزیك پیکابەکەوە، جارێکی تر، بەپەلە، چاوم گێڕا، کەسی وام بەدی نەکرد کە بۆنی هیوای لێ بێ. تەنیا یەك دوو کەسم لەو بەرجادەکەوە بەدی کرد، کە لە سەرماندا بەتەواوی لە نێو پاڵتۆ کۆن و شڕەکانیاندا، خۆیان گرمۆڵە کردبوو.

پیکابەکە سەر بەرەو خوار کەوتەوە ڕەوت، بە گۆڕینی ڕێیدا دیار بوو بەرەو شوێنێکی تر دەمبەن، بەبێ دەنگی، لە قەفەزی پیکابەکەدا تەنیا بەچاو – دەمڕوانییە نێو شارەکە، خەڵکی خوارووی شار کەوتبوونەوە جووڵە. لەسەر شوستەی جادەکان بەرهەمی زستانی و قەفەزە مریشك و گردە پەتاتەم بەدی کرد. خەڵکەکە زۆر ئارام دەهاتەپێش چاوم و، دەنگە دەنگ و قەرەبالغی و هاتوهاواری نێو بازاڕی لای خۆمان، لێرە بەرگوێ نەدەکەوت.

لە بەردەم بینایەکی کۆندا، ئوتۆمبێلەکەیان ڕاگرت. سەرنجم دایە بیناکە، بەپاسەوانیی بەردەم دەرگاکەیدا، کە خۆیان کزۆڵە لە پاڵتۆ سەوز و چرچ و درێژەکانیانەوە پێچابوو، بەکونی تاریکی قوللەی حەراسەتی سەرگۆشەکان، کە تارماییی سەر و کلێتەی سەوز باوی – جارویار – دەنواند، بەتابلۆی تەختەی ڕزیو و شێداری سەر دەرگاکەی – نەدەخوێندرایەوە – هیچ گومانی نەدەهێشتەوە کە ئەوەی لە بەردەمیدا ڕاگیراوم، لە زیندانی «گەڤەڕ» زیاتر چیدی بێت.

یەکێك لە پاسەوانەکانی لێمان هاتە پێشەوە، لەگەل عەریفەکەدا برێ وتووێژی کرد، پاشان لە دەرگای زیندانەکەی دا.

لەکونی سەر دەرگاکەوە، سەرێك هاتە دەر و کەمێك تێی ڕوانین. عەریفەکە، هەر لەو کونەوە، نامەیەکی دایە دەستی، ئەوەندەی نەبرد دەرگا

کرایەوە و سەربازەکان پێش خۆیان دام. لە دالانی زیندانەکەدا کەلەبچکەیان لە مەچەکم کردەوە، ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام، کابرای پشتی دەرگاکە بوو، کە جلی ئاسایی لەبەر دابوو، خەریك بوو بکەومە گومانەوە کە ئەوەی تێیدام زیندانی نەبێت، بەڵام کاتێك سەربازەکان کشانەوە و هەر خۆم و خۆی ماینەوە، هەر چۆنێك بوو ، تێی گەیاندم کە خۆی لێپرسراوی بەندیخانەکەیە و بۆ سەلماندنی ئەمەش دەستی ڕاستی دەکوتا بەسەر سنگیدا و چەند جارێك لەسەر یەك وتی: «بەن...بەن(*)»

دەستی بۆ هەموو بیناکە درێژ دەکرد، بەهەرحاڵ کاتێك بە دالانەکەدا پێش خۆی دام و گەیشتینە بەردەم محەجەرەکان و زێڕەی کردنەوەی، زنجیر و قفڵ و سەدای شیشەی ژەنگاوی گەییە بەر گوێم، ئیدی هیچ گومانم نەما، بەڵام هەر تێ نەگەیشتم بۆ لێپرسراوی زیندان بەرگی ئاسایی پۆشیبوو.

لە ڕارەوەکەدا، بۆ ساردێکی بێزهێنەر دەهات، دیوارەکان، تەرو پەلاوی و بۆر و چڵکن بوون، کابرا پێشم کەوت، چاوم بەدەوروبەری خۆمدا گێڕا. بنمیچی بیناکە، لە زۆر شوێندا، شەقی بردبوو. بەگشتی، هەموو دیمەنێکی بیناکە، ترس هێنەر بوو. بە پلیکانەیەکی پێچاوپێچی تەسکدا سەرکەوت و منیش بەسەرسووڕماوییەوە، بێ ورتە، دوای کەوتم، بنمیچی نهۆمی سەرەوە گەلێك نزم بوو، بۆیە من ناچار بووم کە تەواو خۆم کورکەم، دەرگایەکی کردەوە، ڕێی نیشان دام و فەرمانی پێ دام کە لەسەر کورسییەك دانیشتم و خۆشی چووە پشت مێزێکی تەختەی ئەستوور و قەبەوە، پاش ئەوەی کەمێك ئاڵوگۆڕی بەپێنوس و شووشە مەرەکەبی سەرمێزەکە کرد، کە لە ڕاستیدا هەر شڵەژانی دەگەیاند، لەوەی کە کارێکی پێویست بێت، چونکە هەر پاش ساتێك شتەکانی وەك خۆی دانایەوە.

لە دۆلابێکی ئاسنی کۆندا، کە لە پشت سەریەوە بوو، دۆسیەیەکی

(*) بەن: من

دەرهێنا، پاشان نامەیەك، کە عەریفەکە لە کونی سەر دەرگاکەوە دابوویە دەستی، بەشێنەیی کردەوە و کەوتە خوێندنەوەی. جاروبار چاوی لەسەر نامەکە هەڵدەبری و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، سەیرێکی گوماناوی دەکردم و لە دۆسیەکەدا شتێکی دەنووسی. بەتیلەی چاو کەوتمە پشکنینی ژوورەکە، جگە لە مێزەکەی خۆی و دۆلابە ئاسنینەکەی پشت سەری و کورسییەکەی من، هیچی تری تێدانەبوو (ئەویش هەر زیندانی بوو؟) دوو پەنجەرە سەرنجی ڕاکێشام، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە دەرەوە هەتاو بوو، بەڵام هیچ ترووسکاییەکی ڕووناکی لەو پەنجەرانەوە بەدی نەدەکران، دەتوت بەقوڕ سواخ دراون.

کابرا نامەکەی خستە نێو دۆسیەکەی و هەستایە سەرپێ و لە ناو دۆلابە ئاسنەکەدا تۆپەڵە کلیلێکی دەرهێنا و بەسەر ئیشارەتی بۆ کردم کە دوای کەوم. هاتینە خوارێ. سەراپای حەوشەی زیندانەکە بەفر گرتبووی، لەوە نەدەچوو بەفری ئەمساڵ هێشتا پاك کرابێتەوە، چونکە بەفرەکە قات لەسەر یەك کەڵەکە بووبوو. سەیرێکی پەلەی دەوروبەرم کرد، دیوارەکان بێ ئەندازە بەرزبوون، لە سووچێکی حەوشەکەدا، مێزێکی شکاو سەرنجی ڕاکێشاوم لە دڵی خۆمدا وتم:

«گەر بێت و لەسەر ئەو کورسییەوە پیاو خۆی هەڵدا، ڕەنگە بتوانێ دەستی لە لێوارەکە گیربێت...»

بەبەستە کلیلەکەی دەرگای ژوورەکەی بەرامبەرمانی کردەوە، بەڕارەوێکی تەنگەبەردا تێ پەڕین، بەلای چەپدا دەرگایەك لەسەر پشت بوو، چووینە ژوورێ. تەواو سەرسام بووم؛ چرپایەکی دووقاتی گەورە، سەراپای ژوورەکەی گرتبووەوە و تەنیا نیوە مەترێك لە نێوان چرپاکەو پەنجەرە داخراوەکان، کە دەیڕوانی بەسەر حەوشەکەدا، مۆڵەت هەبوو.

«چۆن ئەم چرپایە هێنراوەتە ژوورێ!؟ سەرو خواری چرپاکە پڕبوو لە

زیندانی. زیندانەوان سڵاوی لە هەموویان کرد و ئەوانیش زۆر بەگەرمی وەڵامیانِ دایەوە. چەند وشەیەکی لەگەڵدا ئاڵوگۆڕکردن و بەدەستیشی ئیشارەتی بۆ من دەکرد و پاشان بەجێی هێشتم. منیش هەروا بەسەرسوورماوی ڕاوەستابووم، لە ڕاستیدا نەمدەزانی چی بکەم. یەکێك کە خەریکی چێشت لێنان بوو، کڵاوێکی شوکاکی لەسەر دابوو، لەسەر تەباخێکی کۆنە، بەکرمانجی پێی وتم: «رۆنیشە برا»، پاشان بە شانازییەوە وتی: من شوکاکم. لە سەر لێواری قاتی خوارەوەی چرپاکە دانیشتم، زیندانییەکان زۆر بەوردی سەرنجیان دەدام.

لەوە دەچوو، زیندانەوان، پێی وتبن کە من دانیشتووی تورکیا نیم. کەس خۆی تێ نەگەیاندم، زۆرم لا سەیر بوو، وەك عادەت لە زینداندا، کاتێك بەندێکی نوێ دێتە ژوورێ، هەموو دەوروخولی دەدەن و دەیان پرسیاری جۆراوجۆری لێ دەکەن، چۆن گیراوی... بۆ و لە کوێ، کە چی ئەمانە هەر هیچ. ئەوان تەنیا بە چاوی گومان و بێ بایەخییەوە تێیان دەڕوانیم.

ژووری زیندانەکە لام سەرنجڕاکێش بوو، بەتایبەتی بەو چرپایەوە کە دیمەنێکی سەرسووڕهێنەوری دەدا بەژوورەکە، لە سەرەتادا لە نهێنیی ئەو چرپایە نەدەگەیشتم، زیندان و چرپا؟! بەڵام پاشان بۆم دەرکەوت کە مەسەلەکە تەنیا بۆ ئەوەیە کە زۆرترین بەند، لەو ژوورەدا قەتیس بکەن، چونکە بەو شێوە نووستنە، دوو ئەوەندە زیندانی جێگایان دەبووەوە.

تا نیوەڕۆ، بە بێ دەنگی، دانیشتم و بیرم لە زیندانەکە دەکردەوە. دیمەنی زیندانەکە، لای من زۆر، نا ئاسایی بوو.

نیوەڕۆ، کاتی نان خواردن، قاپێ ساوەریان نایە بەردەمم و هەر یەکە لە لای خۆیەوە شتێکی پێشکەش کردم، یەکێك کەوچك و یەکێك پەرداغ و دوای نان خواردنیش، بەتانی و سەرینێکیان دامێ، بەڵام بێ ئەوەی هیچ پرسیارێکم لێ بکەن، لە لای دەرگاکەوە، جێگەیان بۆ دیاری کردم.

ئـەو پـاش نـیـوەڕۆیـە، لـەسەر جێگـەکـەم، ڕاکشام، هـەر هـەستـم لای زیندانەکە بوو، کە تا ڕادەیەك سادە و ساکار دەهاتە بەرچاوم. نەتەلبەندی دڕکاوی، نەدەرگای پۆلایین و نە پەنجەرەی ئاسنین وجودی هەبوو. زیاتر لە خانووییەکی ئاسایی دەچوو، ئەگەرچی دیواری زیندانەکە چوار پێنج مەتریکیش بڵند بوو.

بەتانییەکەم لەسەرخۆم لادا، چاوم بەملاولای خۆمدا گێڕا و سەیرێکی پەنجەرەکانم کرد. دەرەوە تاریك بووبوو،

سەریشم بڕێك قورسییەکەی دەمی نیوەڕۆی نەمابوو، بۆیە لەوە دەچوو نووستبێتم، ئەگەرچی تا هەستام، هەر گوێم لە وتووێژی زیندانییەکانی تر بوو، کە بە بەباشیش تێی نە دەگەیشتم، چونکە تورکییەکەی لە کوردییەکەی زیاتر بوو.

هەستام، نەمدەزانی چی بکەم، بۆیە هەر لەسەر جێگەکەی خۆم دانیشتم کە لە ڕاستیدا لەوە زیاتریشم بۆ نە دەڕەخسا، چونکە چەرپاکە سەراپای ژوورەکەی گرتبووەو مۆڵەتی هیچ جموجۆڵێکی نەدەدا.

زیندانییەکان سەر گەرمی ئامادەکردنی شیوی ئێواریێ بوون، هاوکات کەسیشیان هەرخۆی تێ نەگەیاندم کە ئەوەندەی تر باری دەروونی ئاڵۆز دەکردم. هۆی چی بێ ئەم زیندانییانە، بەهیچ شێوەیەکی، توخنم ناکەون، پرسیارێکم لێ ناکەن، ناپرسن لە کوێوە هاتووم، یان لەسەر چی گیراوم؟ تۆ بڵێی مەسەلە زمان بێ و لە من نەگەن؟

بادینەیەکەم ئەوەندەی بڕ دەکرد کە شەرحی حاڵی خۆمی پێ بکەم و لەو زیندانییانە بگەیەنم کە هۆی گرتنم، خەباتە، دژی ڕژێمی عێراقی و من پێشمەرگەم.

کاتێ شیو پێ گەیشت، دەورییەکیان بۆ منیش دانا، برنجی سادە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ جموجۆڵێکی فیزیکیم ئەنجام نەدابوو، کەچی

هەستم بەبرسێتییەکی تەواو دەکرد، بۆیە زۆر بەتاسوقەوە کەوتمە خواردنی برنجەکە.

دوای شیو، کاتی چا خواردن، لێپرسراوی زیندانەکە هاتە ژوورمان و هەموو لەبەری هەستان. بۆ من کارێکی سەرسوورهێنەر بوو کە لێپرسراوی زیندانێك، ئاوا بەشەو، سەر لە زیندانییەکانی بدا؛ بەڵام لەوە سەیرتر ئەوەبوو کە لە ژوورەوە لامان دانیشت، زیندانییەکانیش دەوریان دا، دیار بوو ئەمە یەکەمین جاری نەبوو، چونکە زیندانییەکان، زۆر بەگەرمی و خۆشحاڵییەوە پێشوازییان لێ کرد. هەر خێرا چایەکیان لە بەردەم دانا و پاشان یەکێك لە زیندانییەکان، کە لە هەموویان بەتەمەنتر بوو، کارتۆنێکی نوشتاوەی لەژێر سەرینەکەی دەرهێناو لە بەردەم لێپرسراوی زینداندا کردیەوە و ڕایخست، هاوکات لە توورەکەیەکی نزیك سەرینەکەیدا، پڕیاسکەیەکی کە داشی دامەی تێدابوو، دەرهێنا.

هەردووك کەوتنە دامەکردن، لەوە دەچوو بەرنامەی شەوانەیان بێ؛ چونکە زیندانییەکان وەك کارێکی ئاسایی و ڕۆژانە، بێ سەرسووڕمان، تێیان دەڕوانی.

یارییان دەکرد، جاروبار لێپرسراوەکە بەدەنگی بەرز دەیوت: بلەیزە! کە لەڕاستیدا لێی حاڵی نەدەبووم. لە جموجوڵی داشەکانی زیندانییەکەدا، بەئاشکرا هەست پێ دەکرا کە لە لێپرسراوەکە چاکتری بزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا، بەلێپرسراوەکەی دۆڕاند، کە نازانم مەبەستی ئەوەبوو کەوای نیشان بدات لێپرسراوەکە شارەزاترە یا ئەو هاتوچۆیەی شەوان تێك نەدا، یان هەر بۆ دڵنەواییی لێپرسراوکەبوو. بەهەرحاڵ، ئەگەرچی زیندانییەکەی خۆمان گەلێ باشتر دامەی دەزانی کەچی دۆڕاندی!.

چەند ڕۆژێك تێپەڕی، هەڵویستی زیندانییەکان، لەگەڵمدا، هەروا سارد بوو، تا نیوەڕۆیەك ئەو زیندانییەی کە ئێواران دامەی لەگەڵ لێپرسراوی

زیندان دەکرد، هاتە لام و پرسیارێکی لێ کردم و وتی:

تە خەلکی کێدەری؟

(تۆ خەڵکی کوێی؟)

زۆر پێ خۆشحاڵ بووم بەشکاندنی ئەو تەوقە بێدەنگییەی کەبەدەورمدا کێشرابوو. بۆیە یەکسەر وتم:

«سلەیمانی»

سەروچاوی هیچ کاردانەوەیەکی تیا بەدی نەدەکرا. لەوە نەدەچوو ناوی سلەیمانی بیستبێ؛ چونکە هیچ دەربارەی ئەوەی نەوت و لەباتی وتی:

«تە سەربەست ناس دکەیت؟»

سەربەست یەکێك لە لێپرسراوانی پارتی بوو کە لە دێی پێداو دادەنیشت و بەهۆی شەڕ و شۆڕی ناوەخۆوە یەکترمان دەناسی، بۆیە وتم:

«بەڵێ سەربەست ناس دکەم!»

هەموو زیندانییەکان، گوێ قولاخ بوون، وەك تەنیا چاوەڕێی ئەو وەڵامە بووبن، هەموو لە ناو خۆیاندا کەوتنە مقۆ مقۆ و لەبەر خۆیانەوە دەیانوت «سەربەست ناس دەکات»، کابرای دامەچی وەك کارێکی گەورەی ئەنجام دابێ و نهێنییەکی گەلێ گرنگی ئاشکرا کردبێ، ئاوڕی لە زیندانییەکان دایەوە و پێ وتن: «هەڤاڵ! سەربەست ناس دەکات».

منیش هەر بۆ پشتیوانیی قسەکانی وتم!

«نەتەنیا ناسین بەڵکو برادەریشمە»

ئەمەی دوایان ڕاست نەبوو، ئەگەرچی لە دوای شەڕی هەکاری، یەکتریمان دی بوو، بەڵام بەمەفهومی برادەری، برادەر، نەبووین، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕێزێکی گەلێ زۆریشی لێ گرتین ئەگەرچی ئێمە زیندانی و ئەویش زیندانەوان بوو.

ناسینی سەربەست بوو، بەخێر بۆم، چونکە هەر دوای ئەوە ئیدی هەڵوێستی تێکرا زیندانییەکان، بەرامبەرم، گۆڕا و هەموو کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵمدا و هەوری بێدەنگی لە دەورم بەموعجیزەی سەربەست ناسین ڕەوییەوە، یەکەیەکەی زیندانییەکان ناوی خۆی پێ وتم. دەمەو ئێواری سەرقاڵی خواردنی شیوی ئێوارە بووین، کە بریتی بوو لە نان و ژاژی، کاتێك لێپرسراوی زیندانەکە خۆی کرد بە ژووردا و کەوتە ژماردنمان. زۆر هەوڵیان لەگەڵ دا کەساتێك دابنیشی، بەڵام ئەو قبووڵی نەکرد و هەندێ قسەی بە توڕکی کرد و خێرا دەرپەڕی. لە هەڵوێستی نەگەیشتم. پرسیاریشم نەکرد.

پاش نان خواردن، زیندانییەکانی سەرەوەی چرپاکە لە دەوری مام عەدۆ، کە یەکێك لە زیندانییەکانی ژوورەکەبوو، کۆبوونەوە و ئێمەی قاتی خوارەوەش چوونیە سەرەوەی چرپا کەو لە سەرەتادا هۆی ئەم کۆبوونەوەیە تێ نەگەیشتم.

مام عەدۆ بەڕەنگ و ڕووی، کەمێك گەنجتر بوو لە دامەچی، لەگەڵ ئەوەشدا، سەراپای سەروڕیشی سپی بوو.

مام عەدۆ چاوی بەناوماندا گێرا و وتی:

«کەسی تر ماوە سەرکەوێ؟»

کەس نەمابوو بۆیە برادەرە شوکاکەکە، بەسەر، ئیشارەتی پێدا. لەوەی تەنیشتم پرسی:

«دیارە نیازی یاریتان هەیە؟»

لەسەر عورف و عادەتی زیندان، کە ئێواران، جۆرە یارییەك بۆ وەخت کوشتن دەسازێنن، ئەمەم وت. بەڵام بەندییەکەی تەنیشتم، کە بۆ ماوەیەك وەڵامی نەدامەوە، پاشان بێ ئەوەی سەیرم بکات وتی:

«یاری نا. گوێ لە حیکایەتی ڕۆستەم و زۆراب دەگرین!»

مام عەدۆ وردە وردە، دەستی کرد بە گێڕانەوەی حیکایەتی ڕۆستەم و زۆراب – بەبادینی –دیار بوو شەوانی پێشووتر چەند ئەڵقەیەکی گێڕا بووەوە، چونکە لە باسی هاویشتنی گورزەکانی ڕۆستەمەوە دەستی پێ کرد.

ماوەی نیو سەعاتێك گوێ قوڵاخی داستانی دێرینی ڕۆستەم و زۆراب بووم، سەرنجم دا، دانیشتووان زۆر بەتاسوقەوە گوێڕایەڵ بوون و زۆر بێدەنگ و بێ جووڵە دانیشتبوون.

مام عەدۆ کە دیار بوو چەندین جار ئەم داستانەی گێڕابیتەوە ئەویش خۆی تەواو چووبووە ناو داستانەکەیەوە و بەپێ ڕووداوەکان، ئەمیش، دەست و گورزی دەوەشاند، چاوم بەناو سەروچاوی زیندانییەکاندا گێڕا، سەروچاوی هیلاك و ڕەش داگیرا ساویان. جلی شڕ و پەڕپووتی بەریان، کەسایەتیی نێو داستانەکەی زیاتر لە بەرچاوم بەرجەستەتر دەکرد.

لە ڕاستیدا سەیرم پێ دەهات، لەم عەسرەدا، خەڵکانێ هەبن ئاوا بە حەز و خۆشییەوە بۆ داستانێکی هەزار ساڵەی خەیاڵ ئامێز، ئاوا گوێڕایەڵ بن. بێ کاری بوو، کات بردنەسەر بوو، یان خۆیان لەو عەسرەدا دەژیان، هەرکامیان بێ ئەمان لەزەتێکی سەرسووڕهێنەری، لە گێڕانەوەکەی مام عەدۆ، دەچێژت.

وردە وردە لەگەڵ زیندانییەکاندا بووم بەئاشنا، تەنیا یەکێکی سوورفل نەبێ، کە هەر بەتورکی قسەی دەکرد و دەیویست ڕەگەزی خۆی، بەتورکی ئاخاوتن، بگۆڕێ. لەگەڵ ئەو بەندە سوورفلەدا، هەر ئاشنایەتیم پەیدا نەکرد. زیندانییەکان هەریەکەو بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕامەوە و چۆنیەتی گرتنی خۆی، بۆم، باس دەکرد. تاوانەکانیان لە سێ تاوان بەدەرنەبوو. یا کوشتن، یا دزی و ڕێگرتن یا شەڕ و تێکهەڵدانی نێوخۆ بوو، کە بەداخەوە لە هەموو تاوانەکانی تر زێتربوون، کە دیارە ئەویش ئاوێنەی پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییەکانی نێو کوردستانی تورکیای ئەو ڕۆژەی دەنواند.

بەپێی قسەکانیشیان وایان نیشان دەدا، کە سەریان لە سیاسەت بخوریَ و هەندێکشیان هۆی گرتنەکەیان دەگەڕانەوە بۆ سیاسەت. ئەگەرچی نەیاندەتوانی بە بەڵگە بیسەلمێنن.

ڕووداوی گرتنی یەکێك لە زیندانییەکان کە لاوێکی تازە پێگەیشتووی ڕەنگ گەش بوو، کە لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیدا برێك سادە و تا ڕادەیەك گێلوکەیی پێوە دیار بوو، سەرنجی ڕاکێشام، کاتێك لێم پرسی کە لەسەر چی گیراوە، زۆر بەسادەییەوە وتی:

«لەسەر پیاو کوشتن»

هەر تاوانێکی تری بووتایە بڕوام دەکرد، بەڵام کوشتن؟ گەنجێکی وا سادە و ساکار و گێلۆکە و قەتڵ!.

خۆی پێشکەش کردم، کە شوانە و ئەوەش ئەوەندەی تر سەری سووڕماندم و هەندێ لە ڕەفتارە ساویلکەکانیشی بۆ چارەسەرکردم.

شوانەکە، وەك دڕکی بەسەرسامیم کردبێ، دووبارە وتی:

«بەڵێ لەسەر پیاو کوشتن!»

کەمێك ڕاوەستا و پاشان بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە وتی:

«ئەوەی کوشتم کابرایەکی ئەڵمانی بوو!»

ئەوەندەی تر تامەزرۆیی زانینی نهێنی ئەو قەتڵە بووم، بۆیە خۆم پێ ڕانەگیرا وتم:

«جا تۆیەك شوان، چی تووشی کابرایەکی ئەڵمانیی کردی؟»

یەکێك لە بەندەکان کە گوێڕایەڵی وتووێژمان بوو، بۆنیشاندانی ئاستی وشیاریی خۆی وتی:

«کابرای ئەڵمانی قەپتیالیست بوو!»

مەبەستی ئەوە بوو بەحوکمی ئەوەی ئەڵمانییە، ئیدی، دەبێ کەبیتالیست بووبێ!!

مەسەلەی کوشتنی کابرایەکی ئەڵمانی لەم شوێنە دوور دەستەی کوردستاندا، جێی سەرسوورمان بوو، بەتایبەتی کە لە لایەن شوانێکی نەفامەوە، بێ مەبەست ئەنجام درابێ، چی وای، لە شوانێکی کورد، کردبێ کە دەستی بچێتە خوێنی بابایەکی ئەڵمانی، هەر ئەمەش بوو کە ناچاری کردم کە خۆم بەوردی پرسیاری لێ بکەم.

دەمەو عەسرێك بەندەکان سەرقاڵی دامەبوون، کە شوانەکەم بانگ کردە نزیك خۆم و پێم وت:

«پێم ناڵێی چۆن و بۆ ئەو ئەڵمانییەت کوشت؟»

هیچ لە سەروچاویدا ڕەنگی نەدایەوە، وەکو ئەو نەبووبێت کە ئەو قەتڵەی کردبێ، زۆر بەسادەیی وتی:

«بەیانییەك وەك هەموو ڕۆژەکانی تر، تاریك و ڕوون بەرەو شاخ ئاژەڵەکانم پێش خۆم دا. من هەر بە دوای ئاژەڵەکانەوە بووم کە لە دوورەوە تارماییەکم دی، هەڵدەستا و کەمێك ئاشکرا دەبوو پاشان لە ناو دەوەنەکاندا ون دەبوو، بۆیە دەنگم لێ کرد و تارماییەکەش هیچ وەڵامی نەبوو، کە بۆجاری دووەم دەنگم دا، وەڵامی نەبوو. تا پڕەکەم هێنایە سەرپێ، هیچ گومانم نەبوو کە ئەو تارماییەیە دەبێ ورچ بێ یا گورگ و بۆیە وا بێدەنگ و وەڵامی دەنگدانم ناداتەوە. کە بۆ جاری دوایین دەنگم دا و وەڵامم نەبیست، یەکسەر تا پڕێکم پێوە نا، ئینجا هاواری لێ هەستا. ئاژەڵ نەبوو، مرۆڤ بوو! سوور کارێکی کەتە و زەبەلاح، کە تا ئەو ساتە کەسی وا گەورەم نەدی بوو. قەمسەلەیەکی سەوزی بارانیی لەبەردا بوو، کلێتەیەکی خۆڵەمێشیشی لە سەردا بوو.

کامیرایەکی لە ملدا بوو و جانتایەکی بچووکە لەش بەلاملیدا هەڵواسرابوو، لە ڕاستیدا هەر زەندەقم چوو، بۆیە یەکسەر تا پڕەکەم فڕێ داو ئاژەڵەکانم بەجێ هێشت و بە ڕاکردن گەڕامەوە نێو دێ.

پاش تۆزێ وتی:

«بڕوابکە وەمزانی گورگە»

لەڕاستیدا بە ئەقڵمدا نەدەچوو،، چۆن مرۆڤ ناتوانی جیاوازیی مرۆڤێك و گورگێك بکات. خەریك بوو پرسیار بکەم، کە یەکێك لە بەندەکان کە ئەویش هەر لە سەرەتاوە بەبێدەنگی گوێ قولاخی وتووێژەکانمان بوو، یەکسەر وتی:

«دەستی سەوز دەبێ! کافرێکی کوشتووە!»

بەندێکی تر ملی شۆڕ کردەوە، لە خۆهەڵواسینی سەربەرەو خواری شەمشەمە کوێرە دەچوو، ئەویش وتی!

«ڕەنگە بەم زووانە بەری بدەن، هیچی لەسەر نییە!»

وتوێژ بێ سوود بوو، بۆیە هەر بەسەر لەقاندن کۆتاییم بەوتوێژی نێوانمان هێنا.

لەمەودوا هەندێ زانیاریم سەبارەت بەو قەتڵە چنگ کەوت. ئەڵمانییەکە شوێنەوارناس بوو بوو و هاتبووە کوردستان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و وردەشتی مێژوویی و ئەو سەرلەبەیانییە، کە دنیا تەم بووە، چووتە سەرشاخ و وەك ڕۆژانی تر، گەڕاوە بەشوێن کەلوپەلی کۆندا، کە شوانەکەمان لە گێلێتیی خۆی ونە شارەزایی، تەقەی لێ کردووە.

لەناو زیندانییەکاندا، لە هەموویان زیاتر، شوکاکیەکە بوو بەبرادەرم. پیاوێکی قورس، نیشتمانپەروەر، بەهەیبەت و جوامێر بوو، هەرچەند تۆمەتەکەی ئەمیش هەر قەتڵ بوو، بەڵام ئەمی ئەو لەسەر مەسەلەی عەشائری

بوو کە وەك باسی دەکرد ـ فیتی لێپرسراوانی ناوچەکەشی تێدا بووە کە شەڕ و پشێوی و ئاژاوە بخەنە نێوان عەشرەتە کوردەکانەوە و بەیەکدییەوە ئاڵۆزیان بکەن بۆ ئەوەی نەپەرژێنە سەرخۆیان و هیچ داواکارییەك لە حکوومەتی تورکی بۆ چارەسەری باری ژیانی دواکەوتوویان بکەن.

بەرنامەی ڕۆژانەمان بریتی بوو لە خەوهەستان لە حەوتی بەیانیدا، ئەویش بەلێدانی دەرگاکەمان، کە پاسەوانێك یان بەشەق یان مستەکۆڵە چەند جارێك لێی دەدا. دوای بەرچایی، دەرویەری کاتژمێری نۆ، گەر کەسێك لێپرسینەوە یان دادگایی بوایە، ئەوا دەبرا و گەرنا پاش کاتژمێری (دە)، هەمووومان دەچووینە نێو حەوشەی زیندانەکەوە، بۆ ماوەی نیو کاتژمێر پیاسەمان دەکرد. لە حەوشەکەدا دیوارەکان، کە زۆر بەرز نەبوون، بیریان دەبزواندم. لە پرسیاری ئەوەی کە ئایا ئەوانە دیواری دەرەوەی زیندانن، وەلاّم بەڵێ بوو.

ڕۆژێکیان، کە لەگەڵ هاوەڵە شوکاکیەکەمدا، دوو قۆڵی بەحەوشەی زیندانەکەدا پیاسەمان دەکرد، لێم پرسی، کە تا ئێستە هیچ زیندانییەك لەم زیندانە ڕای کردووە. لە وەلاّمدا وتی، ئەوەندەی ئەو ئاگای لێ بێ، نەبووە.

ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، ئەو ڕۆژە، سندووقە شکاوەکە بوو، کە لە پاڵ دیوارەکەدا دانرابوو. بەرزیی دیوارەکە سێ چوار مەتر دەبوو، کە سەرکەوتن بەسەریدا زەحمەت بوو، بەلاّم بە بوونی سندووقەکە، ئەو مۆڵەتە دەرەخسا. هەر ئەوەش بوو، خستمیە داوی بیرکردنەوە. گەر بتوانم لە ژوورەکەمان بێمە دەرێ و ئەم سندووقە لە حەوشە بێ، ئەوە بەئاسانی دەتوانم بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوم و بازبدەمە ئەو دیو، کە نەمدەزانی ئیدی چی دەبێ.

لە پرسیاری ئەوەی کە دەبێ لەودیو دیواری زیندانەکەوە چی هەبێ، لە شوکاکیەم پرسی و لە وەلاّمدا وتی :

دەرەوەیە!.

ئەی پاسەوان؟ لە وەلامدا وتی:

«پاسەوان، تەنیا لەبەر دەرگا و لەسەر سووچی دیواری پێشەوە هەیە، لەپشت زیندانەکەوە هیچی لێ نییە. ئەو زانیارییە، بۆ من گەلێك دڵخۆشکەر بوون.

بە هاتنە ژوورەوەمان کەوتمە بیرکردنەوە لە ڕاکردن. بەلام چۆن لەم ژوورە لەعنەتییە ڕزگار بم، کێ دەرگام بۆ بکاتەوە؟

لە جێگەکەماندا پاڵ کەوتبووم و خەیاڵم لای دانانی پیلانێك بوو. بەلام چۆن؟ من لە خۆم ڕادەپەڕموو، کە گەر بتوانم بچمە دەرەوەی ژوورەکە، ئیدی بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوم و بازبدەم پاشان چی دەبێ بابێ؟

من هەر هەست و بیرم لای ئەوەبوو کە بیرم بۆ پلانێکی سەرکەوتوو چوو.

هەموو شەوێك، دوای شیوی ئێوارێ، لێپرسراوی زیندانەکە دەهاتە لامان بۆ دامەو کاتێك دەهاتە ژووری ئێتر دەرگا دەکرایەوە و لەدیوی خۆمان بە کێلون، نەقفل، دادەخرا، کە بە ئاسانی لە دیوی خۆمانەوە دەکرایەوە.

من بیرم بۆ ئەوە دەچوو، کە، گەر قفلێك پەیدابێ ، لەکاتی هاتنە ژوورەوەی لێپرسراودا و پاش سەرقاڵ بوونی، بەدامە کردنیەوە، من لەسەر خۆ دەرگاکە بکەمەوە و لەو دیوەوە قفلێکی لێ بدەم ئیدی لێپرسراو بۆ خۆی، لەگەڵ زیندانیەکاندا، تا ڕۆژ دەبێتەوە دەبێ چاوەڕوان بێ و ئەو ماوەیەش بۆ من گەلێك زۆر بوو، کە ئیمکانی هەموو شتێکی تێدا دەبوو، هاوار و داد و فیغانی لێپرسراو و زیندانییەکان، وابە ئاسانی، نەدەگەیشتنە پاسەوانەکانی بەر دەرگا و گەر بشگەیشتبایە ئەوان کلیلی هاتنە ژوورەوەیان پێ نەبوو. دەرگای زیندان، هەر بە کلیکی لێپرسراو، لەدیوی ناوەوە دەکرایەوە.

لای من پلانێکی سەرکەوتوو بوو. ئەی قفڵ؟

مەسەلەی پەیداکردنی قفڵ بەو ئاسانییە نەبوو، تەنیا قفڵێك كە لە بەرچاو بوو قفڵی سەر دەرگای ژوورەكەمان بوو، كە لەدیوی دەرەوە لە ژوورەكەمان دەدرا، ئەو قفڵەش لەكاتی كردنەوەی دەرگاكەدا، گەر پاسەوانەكان بیانكردایەتەوە ئەوە بەدەستیانەوە دەگرت و گەر لێپرسراوەی زیندانەكەش بووایە- كەشەوان بۆ دامە دەهاتە لامان - ئەوا دەیخستە گیرفانییەوە تا دەچووە دەرەوە و پاشان لە دەرگاكەی دەدا.

لەناو ژوورەكەی خۆشماندا، نە تەنیا قفڵ، بەڵكو هیچ ئامێرێك جگە لە كەوچك پەیدا نەدەبوو، بۆیە هیچ هیوایەكم نەبوو، لەوە زیاتر، كە لێپرسراوەكە شەوێك لە شەوان، قفڵەكەی بەدەرگاكەوە بیربچێ و منیش پلانەكەم بەو پێیە جێبەجێ بكەم!

ڕۆژانی شەممە، ڕۆژی سەردانی زیندانییەكان بوو، وەك خۆیان پێیان دەوت «گوریچە» كە مواجەهەی لای خۆمانی دەگەیاند، لەو ڕۆژەدا، جارویار، ناسیاوێك یان باشتر وایە بڵێم كەسێك كە خۆی بەتەرەفدارم دەزانی، سەردانی دەكردم بۆیە بڕیارم دا كە لە هاتنی داهاتوویدا، پلانەكەمی لا بدركێنم، بۆیە بەتامەزرۆییەوە چاوەڕێی هانتی ڕۆژی شەممە بووم.

ڕۆژی شەممە، وەك من پێشبینم كردبوو، دۆستەكەم هاتە لام، زیندانییەكانی تریش هەریەكەو كەسێك یان چەند كەسێك هاتبوون بۆ سەردانیان، بۆیە هەموو سەرقاڵی دەمەتەقێ و وتووێژ بوون، ئەگەر چی ئەم دۆستەی من كە هاتبووە سەردانم لە ڕاستیدا پیاوێكی پڕوپووچ و بێ كەلكیش بوو، بەڵام، لەوە زیاتر، چارم نەبوو.

كەسی ترم نەدەناسی و ئەو كابرایەی بوویكووە فیلی پارەكەم هەر بەتەواوی خۆی لێ گوم كردبووم، بۆیە تەنیا هیوایەك كەمابووم بۆ بەجێ هێنانی پلانەكەم هەر ئەم «دۆستەم» بوو.

سەرەتا، پلانەکەم بۆ باس کرد، ئەویش تەواو گوێرایەڵ بوو. لەڕاستیدا بۆ جێبەجێ کردنی پلانەکەم – لەباتی قفڵ – داوای دەمانچەیەکم لێ کرد لە وەڵامدا وتی:

«دەمانچە زەحمەتە!»

من دەمانچەم نەدەویست، پلانەکەم پێویستی بە دەمانچە نەبوو، هەر بۆ بایەخدان بەپلانەکەم باسی دەمانچەم هێنابووە گۆڕێ، گەرنا ئەو پلانەی من تەنیا پێویستی بەقفڵێك بوو.

کەوتمە باسی وردەکاریی پلانەکەم و لە کۆتاییدا وتم «گەر دەمانچەش پەیدانابێ، ئەوا مەسەلەکە بەتەنیا قفڵێك مەیسەر دەبێ»

هەستم کرد، تەواو سەری سووڕما، بەڕادەیەك کە زەردەخەنە برووسکە ئاساکەشی مەسخەرەی لێ دەتکا و وەك بڕوانەکات وتی:

«قفڵ؟!»

کە «گوریچە» کەمان تەواو بوو، پەیمانی دا کە لە چاوپێکەوتنی داهاتوودا قفڵەکەم بۆ پەیدا بکات و نەتەنیا ئەوەش، لە شەوی جێبەجێ کردن پلانەکەمدا، ئوتۆمبێلێکیشم لە دەرەوەی زیندانەکە بۆ ئامادە بکات کە پێی، دەربازبم.

لەگەڵ سەردانکەراندا زیندانەکەی بەجێ هێشت و ئیدی منیش پاش ئەوە نە لە (گوریچە) داهاتوودا و نەلەهیچ شوێنێکی دی هەر نەمدیەوە.

مەسەلەی پەیدانەبوونی قفڵێك، پلانێکی سەرکەوتووی، دەربازبوونی لە کیس دام. چارم نەما و کەوتمە بیرکردنەوە لە پلانێکی تر.

وردە وردە، لەگەڵ لێپرسراوی زیندانەکە بوومە ئاشنا، ئێوارەیەك بۆ ژوورەکەی خۆی بانگی کردم و کەوتمە دەمەتەقێ. کورد بوو، هەر چەند بەتەواوی کوردی، نەدەزانی، بەڵام بای ئەوەندە دەبوو کە لە یەکدی بگەین.

ژوورەکەی هەروەك ژوورەکەی ئێمە وابوو، هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو، گەر پیاو لەو کورسی و مێزە کۆنەی کە وەك کورسیی چاخانەیەکی کۆن دەینواند و دۆلابێکی ئاسن چاو بپۆشێ، هیچی زیاتر لێ نەبوو، دەستەیەك کلیلی لە پشت کورسییەکەوە، بەدیوارەکەدا، هەڵواسی بوو، دیاربوو کلیلی ژوورەکانی زیندان و دەرگاکان بوو.

لێپرسراو، تاوڵەیەکی هێناو کەوتینە تاوڵەکردن، هەستم هیچ لای تاوڵەکردنەکە نەبوو، زیاتر سەیری ژوورەکەم دەکرد، تەنیا دوو پەنجەرەی تێدا بوو، کە ئەویش زیاتر لە پەنجەرەی زیندانەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپای دەکرد.

تاوڵەکەم دۆڕاند و لێپرسراو بەسەوکەوتنەکەی گەلێ دڵشاد بوو، لە خوا حافیزیدا، کەتابەر ژوورەکەی خۆمانی رەوانەکردم، وتی: «سبەی ئێوارەش دەنێرمە دوات».

بەگەڕانەوەم بۆ ژووری زیندان، تێکڕا زیندانەکان – سوورفل نەبێ – هەموو دەوریان دام، لای ئەوان زۆر گرنگ بوو کە کەسێك زیندانی بێ و بچێتە ژووری لێپرسراوی زیندان، ئەوە رێزلێنانێکی نائاسایی بوو، زۆربەیان پرسیاری چۆنییەتی ژووری لێپرسراوەکەیان لێ دەکردم، لای ئەوان وابوو، کە ئەو ژوورەی لێپرسراوی زیندان دەبێ چ تەلارێك بێ بۆ خۆی، کە لە ڕاستیدا وانەبوو.

چەند زیندانییەکیان برد بۆ لێکۆڵینەوە کە گەڕانەوە پڕۆپاگەندەیەکی ترسناکیان بەنێو زیندانییەکاندا بڵاو کردەوە، یەکێکیان دەیوت لە دادگا، بیستویەتی کە من بەم زووانە دەنێرنەوە بۆ عێراق!

ئەم هەواڵە گێژی کردم. ناردنەوەم بۆ عێراق، مردنێکی ڕاستەوخۆ بوو. دیمەنی زیندانە نهێنییەکانی عێراقم دەهاتەوە بەرچاو، بۆیە یەکسەر بیرم لە پلانێکی نوێ کردەوە، بۆ دەربازبوون. بەهەر شێوەیەك بێ دەبێ، نەهێڵم

بمگێڕنەوە بۆ عێراق. بەڵام چوون؟

ئێواریٚ لێپرسراوی زیندانەکە بانگی کردم، دیاربوو لەزەتێکی تایبەتی لە تاوڵەکەی دوێنیٚ شەوی بردبوو، چونکە هەر بەدانیشتنمان لە ژوورەکەی یەکسەر تاوڵەکەی هێنایە پێشەوە. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام لە ژوورەکەدا کتری و قۆرییەك بوو کەلەسەر عەلائەدینێك دەکولاٚ. ئێمە خەریکی تاوڵە بووین یان بڵێم ئەو خەریکی تاوڵە بوو، منیش بیرم هەر لە دەربازبوون دەکردەوە، «گەر بتوانم بەشێوەیەك کلیلەکانم دەست کەویت، بەڵام بەچ شێوەیەك؟ ئەی وا دەستیشم کەوت، ئەی ئەم لێپرسراوە چی لیٚ بکەم».

لێپرسراوەکە چایەکی بۆ خۆی و چایەکی بۆ منیش دانا، لەم سەرمای زستانی ساردی گەڤەڕەدا، چای گەرم و شیرین خواردنەوەیەکی بیٚ وێنەیە. بەتامەزرۆییەوە. (چا)کەم هەڵدەقوڕاند و هاوکات چاوم بەوردی، بەڵام بەشینەیی، بەدەوروبەری خۆمدا دەگێڕا، ئەوەی سەیر بوو لام هیچ جۆرە چەکێك، لە ژوورەکەدا نەبوو، لە ڕاستیدا لە سیستەمی زیندانی تورکیا نەدەگەیشتم، بۆچی لێپرسراوی بەندیخانە و ژووری لێپرسراو خۆی چەکی لیٚ نەبوو، بۆ من دیاردەیەکی زۆر سەرسووڕهێنەر بوو. تورکیا کە ناسراوە بەعەسکەرتاریەت و لە هەموو شوێنێکدا هەست بەبوونی عەسکەری و چەك دەکەیت، کەچی لەم بەندیخانەیەدا، لە ژووری لێپرسراوەکەدا، تاکە چەکێکی لیٚ نەبوو. تۆ بڵێی ئەم زیندانە تایبەتی بیٚ بە تاوانبارە سووکەڵەکان، بۆیە وا زۆر بەجیدی نەیان گرتبوو، بەڵام قەتڵ بەتاوانی سووك لە قەڵەم دەدریٚ. بۆمن گریٚ کوێرەیەك بوو، کە بۆم شی نەدەکرایەوە. تاوڵەکەم دۆڕاند و چایەکی تریشی پێشکەش کردم ، پاشان کەوتە پرسیار لیٚ کردنم. لای ئەو زۆر سەیر بوو کە دەستگا میت بەتایبەتی، لە گرتنەکەم دەکۆڵێتەوە و بایەخی پیٚ دەدا، دیارە ئەم هیچ ئاگای لە لێکۆڵینەوەکانی (میت) نەبوو، ئەم تەنیا هەر ئەوەندەی دەزانی، کە من بەقاچاغ و بیٚ فیزە، هاتوومەتە تورکیاوە، بۆیە پاش ماوەیەك زیندانی دەنێردرێمەوە وڵاتی خۆم! منیش

دیاره هەر ئەوەندەم بۆ باس کرد، کەنەمزانیوە فیزە پێویستە، چونکە من نیازی مانەوەم لە تورکیا نەبووە و تەنیا وەك ترانزێت پێیدا تێپەڕ دەبووم و دەچووم بۆ سووریا کە بۆ عێراقییەك فیزە پێویست ناکات.

لە خوا حافیزیدا دڵنەوایی کردم و وتی:

«بەم زوانە ماوەی زیندانییەکەت تەواو دەبێ و بەردەبیت»

ئیتر ئەو نەی وت بۆ کێم دەنێرن، وەك دەنگوباسی نێو زیندان دەیانوت بۆ عێراق و وەك خۆشم بیستبووم، دەیانوت بۆ سووریایە. لە چوونەدەرەوەمدا کەتابەر دەرگای ژوورەکەمان هات لێپرسراوەکە بەدەم دەرگاکردنەوە وتی:

«تا لێرەیت ئێواران دەنێرم بەشوێنتدا»

گەڕامەوە ژووریێ. لەوە دەچوو مام عەدۆ داستانەکەی بۆ خوێندبێتەوە چونکە هەریەکەو لە شوێن خۆی، لاڵو پاڵ، لێ کەوتبوو و سەرقالی شتێك بوو.

ڕادیۆیەکەم قەرزکرد و کەوتمە بادانی میلەکەی، بۆ دەنگوباس دمگەڕام و هەر گۆرانیی تورکی بەرەنگارم دەبوو، کۆڵم داو ڕادیۆکەم لای خۆم داناو کەوتمە بیرکردنەوە.

باشە گەر پەلاماری لێپرسراوەکە بدەم کە بەتەنیا و بێ چەکە . ئەی گەر هاواری کرد؟

نە لەژوورەکەماندا و نەلەژوورەکەیدا هیچ ئامێرێك نەبوو کە بەکاربێت، بێ چەك، هەروا ئاسان، نەبوو.

چوومە ژێر بەتانییەکەمەوە و بیرم هەر لەئامێرێك دەکردەوە، کە وەك چەك، بەکاربێت و بتوانم لێپرسراوی زیندانەکەی پێ ناچار بکەم کە کلیلەکانم بداتێ، هەر چەند کلیلەکان هیچ سوودێکی بۆ من نەدەبوو، لەوە زیاتر کە ژوورەکەی خۆی پێ دابخەم و تا ڕۆژ دەبێتەوە بەندی بکەم، چونکە

بەهاتنەدەرەوەم لەژوورەکەی خۆمان، کە لەدواییدا دادەخرا، ئیتر من تەنیا ژووری لێپرسراوەکەم دەما، گەریمتوانیایە، ئەو خۆی لەژوورەکەیدا بەندبکەم، ئیدی ڕاکردنەکەم مەیسەر دەبوو، هەر ئەوەی دەما، بێمە حەوشەکە و بەسەر دیواری پشتی بەندیخانەکەدا سەرکەوم – خۆشبەختانە مێزە شکاوەکە هەر لە حەوشەکەدا مابوو کەمەسەلەی هەڵزنانمی بەسەر دیوارەکەدا ئاسانتر دەکرد و پاشان دەبوو خۆم فڕێی دەمە ئەو دیو زیندانەکە وئیدی ڕابکەم.

هەستم بەسەرما دەکرد، بۆیە قەمسەلە عەسکەرییەکەم داگرت و بەدیوی ناوەوەیدا دام بەخۆمدا، قەیتانی نێو قەدی قەمسەلەکە سەرنجی ڕاکێشام، بۆیە هەستام ڕووبەڕووی، کەوتمە تێڕوانینی، قەمسەڵە ئەمەریکییەکان، زۆربەیان قەیتانێکی زۆر بەهێزیان بۆ شەتەك دانی قەمسەلەکە– لەکاتی سەرمادا – هەیە کە نزیك مەترێك دەبێ، قەیتانەکەم دەرکێشا و چەند جارێك بەتوندی لەم سەرو ئەو سەریەوە ڕام کێشا، پسانی مەحاڵ بوو، بەقەدەر گوریسێکی مەحکەم پتەو بوو. چەند جارێك تاقییم کردەوە.

برادەرە شوکاکیەکەم، بەلاچاو، سەرنجی دەدام و لەم هەڵسوکەوتە عەجیبەم نەدەگەیشت، داوام لێ کرد کەسەرێکی قەیتانەکە بگرێ و خۆشم سەرەکەی تری، هەر دووك بەهەموو هێزمان ڕامان کێشا پسانی، کاری نەکردە بوو. شوکاکیەکە هیچی نەوت، سەری ڕاوەشاند، هەستی بەزەیی لە چاوەکانیدا بەردەوام بەئاسانی بەدی دەکرا. قەیتانەکەم خستە نێو گیرفانی قەمسەڵەکەمەوە و لێی پاڵ کەوتمەوە. «سبەی ئێوارە کارەکەم جێبەجێ دەکەم». بەتانییەکەم دا بەسەرخۆمدا لێی نووستم.

کە ڕۆژ بووەوە من خەریکی تاوتوێ پلانەکەم بووم. پلانەکەشم بریتی بوو لەوەی کاتێك دەچم بۆ ژووری لێپرسراوەکە و دەست دەکەین بەتاوڵە من بەبیانوویەکەوە هەڵدەسمە سەرپێ و لە پشتیەوە قەیتانەکە ڕاست و چەپ

دەكەمە ملی و تا تواناشم هەیە دەیجەڕێنم و بەو پێیەش وزەی لەبەر دەبڕم و پاشان بەكلیلی دەرگاكەی لەسەر دادەخەم و خۆشم دێمە حەوشەو بەسەر دیوارەكەدا سەر دەكەوم و ڕادەكەمە دەرێ، بیرم بۆ لای بەجێ هێنانی پلانەكە دەچوو، لەونەدەچوو زەحمەت بێ. لێپرسراوەكە، بە تەمەن، لە من زۆر گەورەتر و هێز و تواناشی لە گەڵمدا هەر بەراورد نەدەكرا بۆیە دڵنیا بووم لە كەمترین ماوەدا، هەر هەلێكی لە بارم بۆ هەڵكەوێت، پلانەكە بەسەركەوتوویی جێبەجێ بكەم.

ئێوارێ لێپرسراوەكە خۆی هات بە شوێنمدا و لەكاتی دەرگا كردنەوەكەدا هاواری كرد:

«عێراقییەكەم بۆ بانگ بكەن»

قەمسەڵە عەسكەرییەكەم پۆشی و دەستم برد بۆ گیرفانم، قەیتانە كە لە شوێن خۆی بوو. هاتمە دەرێ و لەگەڵ لێپرسراودا بەرەو ژوورەكەی ڕۆیشتین. من لە دوایەوە دەڕۆیشتم و دەمویست لەش و لاری لە پشتەوە تاقی بكەمەوە، لاواز بوو، ئەوە نەبوو دەسەڵاتم، بەسەریدا نەشكێ. لە ڕێگا پێش ئەوەی بگەینە ژوورەكەی ئاوڕی لێ دامەوە و

وتی:

«دوو ئێوارەیە دەیدۆڕێنی با بزانین ئەم ئێوارەیە»

هیچم نەوت، تەنیا پێكەنیم، نازانم پێكەنینی شڵەژان بوو یان موجامەلە، هەر كامیان بوویێ لەو كاتەدا، پێكەنین كارێكی بێ مانا بوو، دانیشتین، وەك دوێنی شەو، چای ئامادە كردبوو، چایەكی نایە بەردەمم، بە وردی تێ دەڕوانیم، نەمزانی بۆ، بەزەیی پێمدا دەهاتەوە یان دەیویست هەستی ناڕەزایی بەرانبەر گرتنەكەم دەربڕێ، چونكە لای ئەو، من لەسەر هیچ، دیارە بە بەراوردی لەگەڵ تاوانبارەكانی تردا، گیرابووم، نەبوونی فیزە و پەڕینەوە لە سنوور، بە قاچاغی لای ئەم هێندە گرنگ نەبوو. هەر

بۆیەش ڕەفتاری لەگەڵ مندا زۆر لە تاوانبارەکانی تر جیاواز بوو.

چاکەم بەپەلە هەڵقوڕاند و جارێکی تر دەستم خستەوە نێو گیرفانم و دەستم دایەوە لە قەیتانەکە، لە شوێنی خۆی بوو.

تاوڵەکەی هێناو لەسەر مێزەکەی دای نا، ئەو خەریکی پول ڕێز کردن بوو، منیش سەیری سەروچاویم دەکرد. ڕەنگی بەلای زەردیدا دەینواند، تەمەنی بەپێی چرچ و لوچی دەم و چاوی، خۆی لە پەنجا ساڵ دەدا، بەهێز نەدەهاتە بەرچاو، بەڵکو زیاتر بەلای لاوازیدا دەیڕوانی. لە ڕاستیدا تەندروستی خەڵکی بەگشتی لە تورکیا، دیارە لە هەژاریدا، زۆر باش نەدەهاتە پێش چاو، زۆربەی هەر زۆری خەڵکی لاواز و ئێسك دەرپەڕیوو بوون، ئەوە چینی جووتیار و گوندییەکان هەر مەپرسە، ئەوان لە خەڵکی ئەم سەر دەمەیان نەدەکرد، هەموو ڕشتاڵە و لاوازو هیلاك و شەکەت و ریشن و چڵکن دەهاتنە پێش چاو، جل و پێڵاوی لاستیکی دڕاویان ئاستی ئابووریی ناهەمواریانی دەخستە ڕوو.

کەوتینە تاوڵە، ئەمجارەیان هەر ئاگام لێ نەبوو، خۆشم نەمدەزانی چۆن یاریم دەکرد، من هەستم لای جێبەجێ کردنی پلانەکەم بوو. سەیرێکی تری لێپرسراوەکەم کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە زیندانەوان بوو، هەر وەك نوێنەری دەسەڵاتداری تورکیا بوو لەم زیندانەدا، کەچی ئەو ترس و لەرزەی کە نوێنەرانی دەوڵەت لە ناوچەی کوردستاندا، پەخشیان دەکرد، بەمەوە، بەو زەقییەوە، دیار نەبوو.

دەستم خستەوە گیرفانم و سەیری لێپرسراوەکەم کرد، ئەو زۆر بەجیدی سەرقاڵی ماڵ کردن بوو، بۆ ئەم پیاوە لەناو ببەم؟ گوناهی ئەم چییە من گیراوم؟ هەستی بەزەییم بزوا، کێ دەڵێ خاوەنی کۆشێ منداڵ نییە، ئەم پیاوەتیم لەگەڵ دەکا، کە شەوانە، وەك ڕێزلێنان بۆ لای خۆیم بانگ دەکا.

دوو شەشی هێناو خەریکی پول گواستنەوە بوو، هەستامە سەرپێ،

هەستی بە بزوادنم نەکرد، چوومە پشتیەوە و دەستم کرد بە گیرفانمدا و خەریك بوو قەیتانەك دەربهێنم کە ئەویش لە پڕێکا هەستایە سەرپێ و بەسەرسوورمانەوە سەیری کردم.

دەستم لە گیرفانمدا شل بوو، وتی: «بۆ هەستاییت؟!»

نەمدەزانی بڵێم چی، دەستم لە گیرفانمدا دەرهێنا و بە پەنجەی دەستم عارەقی نێو چەوانم سڕی دیار بوو برێك تێك چوو بووم وتم:

«وابزانم تەندروستیم تەواو نییە، داوای لێبووردن دەکەم کە ناتوانم یاریت لەگەڵدا بکەم»

بەگومانەوە سەیری دەکردم، چاوی خستە سەر گیرفانم، سەری لەقاند و تاوڵەکەی داخست و بێ ورتە گێرامیەوە بۆ ژوورەکەی خۆمان.

شەوی داهاتوو زیندانەوانەکە بانگی نەکردمەوە، خۆشم کەوتبوومە لێکدانەوە و لە دڵی خۆمدا دەمووت، تۆ بڵێی هەستی بە پیلانەکەم کردبێ، جموجۆڵی نائاساییم، هەستانم لەکاتی تاوڵەکەدا، دەست خستنە گیرفانم و بێدەنگیم و شڵەژانم دەبێ خستبێتە گومانەوە.

زیندانییەکان، بەتایبەتی هاوڕێ شوکاکیەکەم، سەریان لە بانگ نەکردنم سوورما، بەڵام من هیچم نەوت، ئەوەم ئاشکرا کرد کە دەشێ زیندانەوان سەرقاڵ بێ و مۆڵەتی دیتنی منی نەبێ.

سەرنەکەوتنی پیلانەکەم باڵی بێ هیواییی کێشا بەسەر جموجۆڵمدا، کە لە ڕاستیدا لە پاڵکەوتن لەناو جێگەدا و بیر کردنەوە لە داهاتووی نادیار زیاتر نەبوو، ڕۆژی دوا دادگاییم نزیك بووبوومەوە و دڵی دا دەخورپاندم. گەر دادگا بڕیاری ناردنەوەم، کە لە هەموو ئەگەرێك زۆرتر بوو، بۆ عێراق بدا چی بکەم. تا ئێستا لە هەوڵی ڕاکردن نەکەوتووم، بەڵام پیلانەکانم سەرکەوتوو نابن. ئەی چار؟

هەمیشە بە ڕۆژگار هەر خەیاڵم لای دادگا بوو، بۆیە، گۆشەگیر، لە سووچێکی زیندانەکەدا؛ لەناو جێگەکەی خۆمدا، زۆربەی کات هەر دەخەوتم ئەگەر چی خەوی ڕاستیش نەبوو، بەڵکو تەنیا چاو نووقاندن خۆ خەڵافاندن بوو، یان زیاتر بۆ ئەوە بوو کە زیندانییەکان هێندە پرسیاری ڕۆژی دادگام لێ نەکەن. لە ڕاستیدا زیندانییەکان نەیاندەزانی کە چ ئاستەنگێك لە پشتمەوەیە لە عێراق و ئەوان، بە لە بەرچاو گرتنی تاوانە ئاساییەکانی خۆیان، مەسەلەی منیان زۆر بە سادە و ئاسان لە قەڵەم دەدا. نەبوونی ڤیزە یانی گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆت کە زۆربەیان بە پێکەنینەوە دەیانووت، ئەوان نەیاندەزانی گەڕانەوەم بۆ عێراق یانی مەرگم.

سەر لە بەیانییەك هەموو زیندانییەکان هەستابوون و منیش هێشتا هەر لە جێگاکەمدا بووم کە تەقەی پۆستاڵ و کردنەوەی دەرگای ژوورەکەمان بە تەواوی دڵی دا خورپاندم، سەیری کاتژمێرەکەی مەچەکم کرد، هەشتی سەر لە بەیانی بوو، هاتنی سەرباز بۆ نێو زیندانەکە، تەنیا، یانی گواستنەوەی بەندیان بردنی بۆ دادگا بوو.

زیندانەوانەکە هاتە ژوورەوە، دوو سەربازی پڕ چەك بە تەواوی تفاقی جەنگییەوە لە پشتیەوە بوون. زیندانەوانەکە پارچەیەك کاغەزی لە گیرفانی دەرهێنان، (خوایە من نەبم)و ناوی منی خوێندەوە و داوای خۆ گۆڕینی پەلەی لێ کردم.

بە پەلە خۆم گۆڕی و هەر لەوێدا کەلەپچەیان کردە مەچەکم و بەسەر و دەم و بە دەستم خواحافیزیم لە بەندەکان کرد. مام عەدۆ و هاوڕێیە شوکاکیەم چاویان پڕ بوو لە ئاو و شتێکیان بە تورکی وت، کە دەبێ هەر خواحافیزی بێ.

لە بەردەمی دەرگای زیندانەکەدا پیکابێکی عەسکەری ڕاوەستا بوو، چاوم بەدەوری خۆمدا گێڕا، کەسم زیاتر لە سەربازەکان بەدی نەکرد.

ڕۆژێکی سارد بوو، دنیا هەمووی بەستبووی، بە پاڵ کردمیان بە پاشکووی پیکابەکەدا کە قەفەزی ئاسن بوو، هەردوو سەربازەکەش لەگەڵمدا سوار بوون، لە سەرو پۆتەلاکیاندا هیچ نەدەخوێندرایەوە و یەکێکیان خێرا خێرا، ئەگەر چی دەستکێشی لە دەستدا بوو، لە سەرما، هەر فۆی دەکردە نێودەستی، ئەوی تریان ڕەق و وشك، بێ جووڵە، تەنانەت چاویشی نەدەترووکاند بەرامبەرم دانیشتبوو.

بەناو شار گەڤەڕدا تێ پەڕین، خەڵکی تازە دووکانی دادەنا و دانیشتووانی شاریش تاکوتەرا بەسەر شەقامەکاندا بەدی دەکران.

لە بەردەم دادگا ڕایان گرتم و یەکێك لە سەربازەکان چووە ژوورەوە پاش ساتێك گەڕایەوە. دایانگرتم و بۆ نێو بینای دادگا، پێش خۆیان دام.

شوێنەکەم دەناسیەوە، هەر ئەو جێگەیە بوو کە جاری پێشوو هێنابوومیان بۆ لای دادوەر، لە بەردەم ژووری دادوەردا ڕایان گرتم، هەر چاوم بەملاو لای خۆمدا دەسووڕاند، بەو هیوایەی کەسێك ببینم و بتوانم لە ڕێیەوە، وەلامێك بۆ لای خۆمان، لەو دیو، بنێرم.

هەستم بەسەرمایەکی سەیر دەکرد، نازانم هی نیگەرانیم بوو لە داهاتوو، یا ترسی دادگا و بڕیاری نادیاری، یان هەر خۆی سالۆنەکە سارد بوو، هەر چییەکیان بووبێت، من تەزووی سەرما بەگیانمدا سەر و خواری دەکرد، ئەگەرچی بەدەم نووقاندم و خۆ جیڕ کردنەوەم، نەم دەهێشت سەربازەکان هەستم پێ بکەن، هەر چەندە ئەوانیش سەرما بوونی خۆیان نەدەشاردەوە و لە جێگەی خۆیان جارویار هەڵدەبەزینەوە و زوو زوو فوویان بەدەست کێشە ئەستوورەکانیاندا دەکرد.

هێندە نەوەستابووین کە دەرگای ژووری دادگا کرایەوە و منیان بردە ژوورێ. هەر ئەو شوێنەی پێشوو بوو. دادوەر لە شوێنەکەی خۆی دانیشتبوو، قژە دەستکردەکەی، لەسەردابوو، لە تەنیشتییەوە لای ڕاست تەرجومانەکە،

کە هەر هەمان تەرجومانی پێشوو بوو، دانیشتبوو. بەپێوە ڕاوەستابووم و ژوورەکەش بێدەنگیی لێ دەتکا. دادوەر سەیرێکی پەلەی کردم و پاشان کەوتە تاووتۆیی نێو فایلەکەی ژێر دەستی.

ماوەی چەند دەقیقەیەك هەروا ڕاوەستابووم، دادوەریش کەلاپەڕەکانی ژێر دەستی هەڵدایەوە. جاروبار و سەرێکی دەلەقاند، کەتەواو دڵخورتی دەکردم. تۆ بڵێی چی لەو فایلە دا، دەربارەی من نووسرابێ، ئەوە هیچ، بەگێرە شێوێن و یاخی و سنوورشکێن لە قەڵەم دراوم. ئەوە هیچ گومانم لێی نەبوو، بەڵام نەمدەزانی ئایا بەتاوانی ئەوەی گوایە چەك لە سۆڤیەتەوە دەهێنم و شۆڕش! لە کوردستانی تورکیادا بەرپا دەکەم، تاوانبارکراوم یان نا؟

قسەکانی (میت) و پرسیارە بێ جێکانی قائمقامی شاریش، کە باسی هاوردنی چەکی لە سۆڤیەتەوە دەکرد، دەهاتەوە یادم.

دادوەر سەری هەڵبڕی و کەوتە قسە، تەرجومانە کە وتی:

«تاوانی سەرەکیی تۆ، کە لە ڕووی یاساییەوە بتوانێن بڕیاری لەسەر بدەین، هەر ئەوەیە کە تۆ بەقاچاغ، بێ فیزە هاتویتە نێو تورکیاوە»

کەمێك ڕاوەستا و بەزەردەخەنەیەکەوە وتی:

«هەر ئەوەیە و سزای خۆشت لێرە، لامان خوارد کە زیندانی بوو. ئیدی کارمان بەتۆنییە و بۆ وڵاتی خۆت دەتنێرینەوە!»

کاتێك تەرجومانەکە ئەوەی سەرەوەی پێ، ڕاگەیاندم دڵم کەوتە کوتە و سەراپای گیانم بۆ بەعارەق، بەڕادەیەك کەتکەی عارەقی ناوچەوانم دای بەسەر کاشییە بریسکەدارەکانی ژووری دادوەردا کە بەئاشکرا هەستی پێ کرد. پاڵم بەدیوارەکەوە دا. (یا ئیلاهی بۆ وڵاتی خۆم!) مەبەستیان عێراق بوو.

گەڕاندنەوەم، بۆ عێراق، مەرگێکی سەد دەر سەد بوو، بەرچاوم تاریک بوو. دڵم بەتوندی لێ دەدا. ئەبێ وەزعم تەواو تێک چووبێ، چونکە دادوەرەکە بەسەرسوورمانەوە وتی:

«نەخۆشی؟»

نەم دەزانی بڵێم چی، چیم بدرکاندایە؟ بموتایە بەگەڕانەوەم بۆ عێراق یەکسەر ئیعدام دەکرێم؟. بێدەنگ بووم.

دادوەر داوای کورسییەکی بۆ کردم. کە لەسەر کورسییەکە دانیشتم، دادوەر، زۆر بەوردی سەرنجی دەدام. ئەم جارەیان وتی:

«بتنێرم بۆ خەستەخانە؟»

پەیتا پەیتا عارەقم دەردەدا، دیاربوو دادوەر بەتەواوی هەستی بەتێکچوون و نیگەرانیم کردبوو. لە وەڵامیدا وتم:

«پێویست ناکات»

لە ڕاستیدا دڵەکوتەیەك گرتبوومی، کە خۆم، بەئاسانی گوێم لە تەپەی دڵم دەبوو، بەڵام تازە خەستەخانە چی.

بیرکردنەوە لە زیندانی «هەیئەی کەرکوك»، ئەوەندەی تر دڵخورتی دەکردم.

دادوەر فایلەکەی بەردەمی داخست و جەرەسێکی لێ دا. یەکێك لە سەربازەکان هاتە ژوورەوە هەر لەوێدا، کەلەپچەکانیان کردەوە مەچەکم و پێش خۆی دام. خەریك بوو لە دەرگای ژوورەکە بچمەدەرەوە کە تەرجومانەکە وتی:

«هەر یەکدو ڕۆژی تر لامان دەبی و ئیدی ڕەوانەت دەکەین!»

ئای لەوخەبەرە! خستمیانە نێو قەفەزەکەوە، بەرەو خوار ڕووەو زیندانی

گەڤەرِ ملی نا. کاتێك چوومە ژوورەکەی خۆمان هەموو زیندانییەکان – جگە لە سوورفل – دەوریان دام و هەریەکە پرسیارێکی لێ دەکردم.

دیارە، زیندانییەکان، دڵخۆش بوون بەوەی گوایە بەردەبووم و بۆ «وڵاتی» خۆم دەگەڕێمەوە!!

ئاخر ئەوان نەیاندەزانی لە عێراق چ گۆ بەندێکم لە پشتە. زیندانییەکان سەریان لەوەش سوڕما، کە من خۆشحاڵنیم و زەوقی ئەو زیندانییەم نییە کە مژدەی بەربوونی دەدرێتێ، لە ڕاستیدا نەمویست ئەمانیش بزانن کە لە عێراق زیندانی بووم و فەرمانی خنکاندم هەیە. لە جێگەی خۆم پاڵ کەوتمەوە و بەتانییەکەم دا بەخۆمدا، ئەمەش هەر لەبەرئەوە بوو کە لە پرسیاری زیندانییەکان قوتاربم.

نازانم چەند نووستم، کە هەستام زیندانییەکان خەریکی شیوی نیوەڕۆ بوون. زیندانییەکان سفرەی نانخواردنیان ڕازاندەوە کە لە ڕاستیدا لە ساوەر و پیاز زیاتر نەبوو – و منیشیان بۆ سەر خوانەکەیان بانگ کرد. زۆر هەوڵم دا کە بەشداری نەکەم، چونکە دڵم گیرابوو، هیچم پێ نەدەخورا، لەگەڵ ئەوەشدا دڵی زیندانییەکم نەشکاند و چوومە سەر سفرەکەیان. خۆم بەیەکدو کەوچك ساوەرەوە سەرقاڵ کرد. بیرم هەر لای گەڕانەوە و تەسلیم کردنەوەم بوو بەعێراق. تۆ بڵێی لە گەڕانەوە بۆ سەر سنووری عێراق، مۆڵەتێك پەیدا نەبێت. بە شوکاکیەکەی برادەرم وت:

«سنووری عێراق لێرەوە چەند دەبێت؟»

لەوەڵامدا وتی:

«لێرەوە تا (چوخورجە) هەر دووسێ سەعات دەبێ»

چخورجە، سنووری تورکیا و عێراق بوو.

مام عەدۆ، وەك بیەوێ دڵنەوایم بکات وتی:

«گەر سبەینێ، ئینشەڵڵا، بتبەن بۆ سنوور ئەوا بۆ سبەی ئێوارێ لە ماڵی خۆتانی!!»

دڵیم نەشکاند، هیچم نەوت.

پاش نیوەڕۆ، بەنووسینی هەندێ نامەوە، خۆم مەشغوول کرد و دەمەو ئێوارێ نامەکانم دا بە هاوڕێ شوکاکیەکەم. کاتێ نامەکانی لێ وەرگرتم بەسەرسووڕمانەوە وتی:

«باشە تۆ خۆت دەگەڕێیتەوە ئیتر ئەم نامانە چییە؟»

بەشێنەیی تێم گەیاند، کەمن نابرێمەوە ماڵ کاتێ تەسلیم بەپۆلیسی عێراق دەکرێم – بەڵکو بەرەو زیندان دەمبەن. بەکورتی باسی تەنگوچەڵەمەی خۆم، لە عێراق بۆ کرد ئەوسا، لە نهێنیی نامەکان گەیشت.

نامەکان بۆ هەندێ دۆست و ناسیاوی خۆم بوون، کە تێیدا باسی چۆنیەتی گیران و تەسلیم کردنەوەم بەعێراق کردبوو.

بەرە بەیان، دوای بەرچایی لە دەرگای ژوورەکەمان درایەوە دیاربوو بۆ منە بۆیە منیش پێش وەخت، هەر بەبیستنی جموجۆڵی نێو حەوشەکە، یەتاغەکەم قەدکردبوو، ئامادەبووم. کاتێك دەرگا کرایەوە، سێ سەرباز هاتنە ژوورێ، بەدەنگی بەرز هاواری ناوی منیان کرد و منیش یەکسەر وەڵامم دانەوە، هەر لەوێدا کەلەپچەیان کردمەوە. خواحافیزییەکی بەپەلەم لە زیندانییەکان کرد. شوکاکی هاوەڵم بەخۆر دەگریا، کەجیی سەرنجی سەربازو زیندانییەکان بوو، پێش ئەوەی بمبەنە دەرێ، بەتوندی باوەشی پیاکردم و چەند جارێك ماچی کردم، کە بەدڵی سەربازەکان نەبوو، چونکە بەتوندی پاڵیان پێوە ناو دووریان خستەوە لێم.

سواری پیکابە قەفەزییەکەیان کردم و ئوتومبێلەکە کەوتەڕێ، ئەوی سەرنجی ڕاکێشام بەرەو خوار نەبوو. زیندانییەکان سنووری عێراقیان بۆ

دەست نیشان کردبووم، کە دەکەوێتە خواروی زیندانەکەوە، بەڵام ئوتومبێلەکەی ئێمە ڕێی سەرەو ژووری گرت، بۆیە لە دڵی خۆمدا وتم:

«تۆ بڵێی بۆ دادگام بەرنەوە؟»

بەبەردەم بینای دادگا دا تێ پەڕی ونەوەستا، پیکابەکە، بەلای چەپدا سووڕی داو کەوتەوەڕێ. لە بەردەم دەرگای سەربازگەکەدا، کە ماوەیەك تێیدا زیندانی بووم، ڕاوەستا. لەسەرەتادا وەمزانی بۆ زیندانەکەی نێو ئەویم دەبەنەوە.

لە پیکابەکە دایان بەزاندم، بەڵام نەیانکردمە ژوورەوە و لەبەر دەم دەرگا کەدا ڕایان گرتم. ئاورم لە ڕۆژهەڵات دایەوە، شاری گەڤەر بەئاستەم دەبینرا، تیشکی لاواز و ڕووناکی ڕۆژ بەسەر شاردا دەکشا و خۆی دەدا لە ڕێگە سەهۆڵییەکە – کە هێشتا نەکرابووەوە و – بریسك و باقی دەدایەوە و تەمێکی نزمی بەسەر ڕێگاکەدا دروست دەکرد.

ئاسمان، شینباو، بێ هەور بوو. ئۆتۆبووسێك، دڕی بەتەمەکە دەدا و، ڕووە و ئێمە دەهات.

دووسەرباز و عەریفێك لە دەرگای سەربازگەکە هاتنەدەرێ و لەدوایانەوە ئەفسەرێك هاتە نێو دەرگاکە. بەڵێ هەر ئەو ئەفسەرە بوو کەیەکەمین شەوی گرتنم لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردم. هیچ قسەی لەگەڵ من نەکرد و بانگی عەریفەکەی کرد و زەرفێکی زەردی دایە دەست کە بەمۆم تەمغەکرابوو.

ئۆتۆبۆسەکە، لامانەوە، ڕاوەستا. ئەفسەرەکە برێ قسەی لەگەڵ عەریفەکە کرد، پاشان چووە ژوورێ. عەریفەکە منی پێش خۆی دا بۆ نێو ئۆتۆبۆسەکەو دوو سەربازەکانیش بەدووماندا هاتن. لە سەر دوو کورسی دانیشتین.

من و عەریفەکە بەتەنیشت یەکەوە، سەربازەکانیش لەدوامانەوە دانیشتن.

دیاربوو ئەو جێگایانەیان بۆ حجز کردبووین، چونکە ئۆتۆبۆوسەکە گەیشتە لامان، تەنیا ئەو دوو جێگەیەی بەتاڵ بوو.

ئۆتۆبوسەکە کەوتە ڕێ. لەسەرەتادا ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، پەنجەرە گەورەکانی ئۆتۆبووسەکە بوو، کە نەدەکرانەوە بۆیە سەیرێکی عەریفەکەم کرد، پێم وت:

بۆ ئەم کەلەپچانەم لە دەست ناکەنەوە، خۆ ئێوە سێ سەربازی پڕچەکن ناشێ، لە پیاوێکی بێ چەك بترسن!

سەرەرای ئەوەش ئەم پەنجەرانە ناکرێنەوە ئیتر بۆ دەترسن...

یەکێ لە سەربازەکان کە زازا بوو، هەر ئەو زازایە کەشەوی یەکەم «تەرجومانم» بوو هەرچۆنێك بوو قسەکانی منی بۆ تەرجوومە کرد. نازانم قسەکانی من کاریگەر بوون یان خۆی وەك تەحەدایەك، یەکسەر زەرەفەکەی نێودەستی دڕاند و کلیلی کەلەپچەکانی دەرهێنا و مەچەکی کردمەوە.

عەریفەکە سەیری کردم وتی:

«فەرموو ئەوە مەچەکم کردیتەوە بزانین چی دەکەیت؟!»

لەوە دەچوو قسەکانم کاری تێ کردبێ و هەستی بەوە کردبێ کە سێ سەربازی پڕچەك چۆن ناتوانن بەرەنگاری کابرایەکی بێ چەك بن. عەریفەکە ئاوڕی لە کورسییەکانی پشتەوەمان داو وەك داوا لە «تەرجومانە» کەمان بکات وتی:

«ئەم زەرفە دەبوو لە سەر سنوور بکرێتەوە، پاشان سەیری منی کردو وتی: بەڵام وامن هەرلێرەوە بۆم کردیتەوە»

گەلێك سوپاسی عەریفەکەم کرد، دەست کردنەوەم گەلێ مۆڵەتی بۆ دەرەخساندم.

پاڵم لێ دایەوە و لە پەنجەرە گەورەکانەوە سەیری دیمەنی دەرەوەم

دەکرد. سروشتێکی قەشەنگ، بەفری قەراغ جادەکەش ڕوخسارێکی گەلێ دڵفرێنی پێ دابوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە نوقمی تەماشای دیمەنی دەرەوە بووم، بیرم هەر لای خۆم و پیلانێك بۆ دەربازبوون بوو! نەبردنم بەئوتۆمبێلێکی سەربازی و لەقەڤەزی ئاسندا بۆ سەر سنوور، خۆی لە خۆیدا، مۆڵەت ڕەخسانێك بوو کە دەبوو، سوودی لێ وەرگرم.

ئۆتۆبوسەکە لە شاری (باشقەڵا) لە چێشتخانەیەك لای دا. ئەگەرچی ماوەی نێوان گەڤەر و باشقەڵا هێندە دوور نەبوو، کەچی زۆریەی موسافیران لە چێشتخانەکە داوای نانخواردنیان کرد بۆیە منیش پێشنیاری نانخواردنم بۆ سەربازەکان و عەریفەکە کرد، کە بەخۆشحاڵییەوە قبووڵیان کرد.

ئەوان خەریکی نانخواردن بوون و منیش بەچایەکی گەرمەوە خۆم خەریك کرد. سەربازەکان لەکاتی نانخواردنیاندا چەکەکانیان لەتەنیشت خۆیانەوە دانا. بیرێك لە مێشکمدا تۆوی چاند.

ئۆتۆبووسەکە کەوتەوە گەڕ. عەریفەکەش سوپاسێکی گەرمی کردم. لەوە دەچوو، دەمێك بێ خواردنی وا چەور و دڵخوازی خۆی نەخواردبێ.

ڕێگەی نێوان (باشقەڵا) و (وان) سەختتر دەهاتە پێش چاو، عەریفەکە - لە ئەنجامی ئەو خواردنە قورسەی خواردبووی - وەنەوزی دەدا. دەعوەتەکەم کاری خۆی کردبوو.

کاتێك گەیشتینە (وان) عەریفەکە وتی:

«دەچینە نەقڵیاتی (ماردین) بابزانین ئوتۆمبێلێك پەیدا دەبێ»

بەفر بەتەواوی لەنێو (وان) یش باری بوو. شەقامەکانی بوویبوونە جلیتاو، ئۆتۆمبێلەکان بەئەزیەت ڕێیان دەکرد. لە نەقڵیات پرسیارکرا. خۆشبەختانە ئوتۆمبێل نەبوو، عەریفەکە سەیری کردم و وتی:

«دەمانویست هەر ئەمڕۆ بتگەیێنینە (ماردین) بەڵام بەفر ڕێی گرتوە. جا چۆنت دەوێ».

لە مەبەستی نەگەیشتم بۆیە پرسیاری ڕوونکردنەوەی «چۆنت دەوێت»م لێ کردەوە کە عەریفەکە بە پێکەنینەوە وتی: «دەتەوێ بتبەین بۆ زیندانی (وان) و شەو لەوێ بەسەربەری یان بچینە ئوتێلێکی ئاسایی و تۆ پارەکەی بدەی؟» دەستم کرد بەگیرفانمدا و چیم پارەی تورکی پێ بوو نیشان دا. لە ڕاستیدا عەریفەکە خۆی حەزی لەوەبوو، لە ئوتێلێکی پاك و تەمیز دابەزێ و منی کردە بیانوو.

ماوەیەك بەناوشاری (وان) دا گەڕاین. (وان) یەکێکە لە شارە جوانەکانی کوردستان بەتایبەتی گوڵی وان، ڕوخسارێکی گەلێ دڵڕفینن و جوانی بەشارەکە دەدا. لە بەرچاوم لە شارێکی ڕۆژئاوای دەکرد.

سەبازەکان لەدواوە و من و عەریفەکەش لە پێشەوە ڕێمان دەکرد، من زیاتر لە لێپرسراوێکی دەولەتەکەی خۆیان دەچووم، وەك لە زیندانییەك! دوو سەرباز لە پشتمەوە ڕێ بکا، هەر دەبێ لێپرسراو بم!

لەبەردەم ئوتێلێکدا ڕاوەستاین، عەریفەکە چووە ژوورێ، فرسەتم هێناو بەسەربازەکانم وت:

«دیارە برسیتان بووەتەوە حەزتان لە چییە»

هێشتا وەڵامیان نەدابووە وەك، کە عەریفەکە هاتە دەرەوە. خۆشحاڵ بوو، بەپێکەنینەوە وتی:

«ئوتێلێکی پاکەو ئەمشەو لێرە دەبین»

پرسیارەکەمم لە عەریفەکەش دووپات کردەوە لەوەڵامدا وتی:

«هەر چیمان دەدەیتێ، ئێمە مەمنوونین»

بەناوبازاڕەکە دا پیاسەمان دەکرد و سەیری کۆگاو مغازەکانی شارمان دەکرد، (وان) شارێکی زۆر جوان دەهاتە پێش چاوم. نازانم هی ئەوەبوو ماوەیەك زیندانی بووم یان هەرخۆی شارێکی ڕێکوپێك بوو یان ڕەنگە

هەستی سەربەستی بێ کە لە هەوای ئازادی دا، بێ کەلەپچە و زنجیر، ڕێم دەکرد.

بەناو پاساژێکدا ڕۆیشتین و لەوێ لەبەردەم دووکانێکدا پێم وت:

«حەز دەکەم وەك دیاری هەریەکەتان شتێ هەڵبژێرێ»

لەسەرەتادا عەریفەکە دوو دڵ بوو، بەڵام کاتێ بینی خۆشم جووتێ پێڵاوی تازەم کڕی، ئەویش کراسێکی بۆخۆی و سەرو جووت گۆرەوی بۆ سەربازەکان هەڵبژارد.

پێلاوەکانی خۆم تۆزێ لە کارکەوتبوون، بۆیە ئەم پێڵاوە تازانەم کڕی و کاتێك پێڵاوەکانم تاووتوێ دەکرد لە دڵی خۆمدا وتم:

«بۆ ڕاکردن، ئەم پێڵاوانە باشە!»

کەوتینە پیاسە، بەچەند چێشتخانەیەکدا ڕەت بووین و دیاربوو عەریفەکە برسی بوویبوەوە چونکە بەدیقەتەوە ناوی خواردنەکانی دەخوێندەوە کەبەسەر شووشەی جامخانەکانەوە نووسرابوون.

لەبەردەم یەك دوو چێشتخانەدا فەرمووم لێ کردن، بەڵام عەریفەکە، بەسەر لەقاندن، ناڕەزایی خۆی نیشان دا. دیارە دەیویست خۆی بڕیار بدا یان خواردنێکی وا بدۆزێتەوە کە دەمێکە عەودالێتی.

لە ڕاستیدا لە برسێتیی ئەم سەربازانە نەدەگەیشتم، ئەوان لە (باشقەلا) نانیان خواردبوو، سەرم سوڕما، بەڵام زۆر پێ خۆشحاڵ بووم کە دەیانەوێ جارێکی تر نان بخۆن. دەمویست تا دەتوانن بخۆن بۆ ئەوەی هێند قورس بن کەتوانای جووڵەیان نەمێنێ.

لە دووکانی گیپەخانەیەك عەریفەکە لای دا، لەوە دەچوو ئەو خواردنەی حەزی لێ بوو، گیپە بێ.

سێ نەفەر گیپەیان داواکرد و زۆریان لەمنیش کرد کە شتێ بخۆم، بەڵام

من سەرنجی جومجومەی سەری ئاژەڵە کوڵاوەکەم دەدا، کە هەڵاو لەکونی چاوەکانیەوە وەك دووکەڵکێش دەهاتە دەرێ و دانە ڕیچەکانیم دەدی، خەریك بوو هێڵنج بدەم. مردوویەکی کوڵاو، بەهەمووئیسك و پرووسکییەوە، لەسەر سینیەکی مس، هەڵدارابووەوە، کابرای گیپە چێش قۆڵی لێ هەڵماڵیبوو بەو سەرمایە – خەریکی هەڵبژاردنی پێچکەو زمان و داتەکانی مۆخ بوو بۆ سەربازەکان، کە «فەرمان»م دابوونێ، هەرچی دەخۆن بیخۆن.

ئەوان سەرگەرمی بیێچکە کرانەوە و کەللە شکاندن و مۆخ هەڵلوشین بوون و منیش هەستم لای دۆزینەوەی هەلێك بوو، بۆ ڕاکردن لەدەستیان:

ڕاستە چەند ساڵێك لەوەو بەر (وان)م دی بوو، لە سەفەرێکمدا کە لە تارانەوە بۆ ئەستەمبوڵ دەچووم، بەڵام تەنیا پیا تێپەڕیبووین، بۆیە هیچ شارەزای جادەو کۆڵانی نەبووم، لە دڵی خۆمدا وتم:

«باشە وا لەم هەلەدا ڕابکەم لەدەستیان، بۆ کوێ بچم، من هیچ شوێنێك شارەزا نیم»

پارەی خواردنەکەیانم داو پێکەوە تالای ئێوارە بە شاری (وان) دا دەگەڕاین، لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژە لەگەڵیاندا لە زیندانی نەدەچووم، دیارە گیپە چەورەکان کاریگەرێتیی خۆیان نواندبوو.

دەمەو ئێوارێ هاتینەوە بۆ ئوتێل، من هەموو هیوایەکم بەشەوی ئوتێلەکە بوو، کە شتێکی تێدا ئەنجام بدەم.

ژوورێکی چوارنەفەرییان دابووینێ، قەرەوێڵەکانیان بەجۆرێ دامەزراند کە من کەوتمە نێوەڕاستیان، ئەوەش گرنگ نەبوو لام، بەڵام کاتی نووستن کاتێك دەرگای ژوورەکەیان لەدیوی خۆمانەوە داخست و کلیلەکەیان دا بەعەریفەکەیان و ئەویش خستیە نێو گیرفانی سەر دڵی، ئیدی هیوام لەهەموو هەوڵێك بڕا.

ئەو شەوە هەر نەنووستم و گینگڵم، دەدا بەو هیوایەی عەریفەکە هەستێ

بۆ تەواڵێت و پاشان بیری بچی دەرگای ژوورەکە دابخاتەوە! ئەوسا من بتوانم هەڵێم کە لە ڕاستیدا هیچی لەو بابەتە ڕووی نەدا و عەریفەکە ئەو نووستنەی لێی نووست، تا کاتژمێر حەوتی بەیانی لێی، هەڵنەستا. دیاربوو خواردنە قورسەکان و گیپە چەورەکە تەواو مریان کردبوو.

بەیانی، دوای بەرچایی، چووینە دەرێ و بەرەو نەقلیاتی ماردین ڕێکەوتین، وەلآم هەروەك دوێنێ بوو، کە ڕێ بەفر گرتوویەتی و هیچ مەجالی هاتوچۆ نییە، بۆیە عەریفەکە پێشنیاری کرد کەبەرەو (دیاربەکر) بڕۆین.

چوونمان بۆ (دیاربەکر) مۆڵەتی ڕۆژێکی تری بۆ دەرەخساندم، بۆیە من زۆر خۆشاڵیی خۆم دەربڕی. ماوەی نێوان (وان) و (دیاربەکر) بەو زستانە، ڕۆژە ڕێیەك دەبوو. لە ڕۆژە ڕێیەکیشدا – لە دڵی خۆمدا دەموت – تۆ بڵێ مۆڵەتیك پەیدا نەبێ.

وەك جاری پێشوو من و عەریفەکە پێکەوە و دوو سەربازەکەش لە دوامانەوە دانیشتن ئەگەرچی کەلەپچەیش نەکرابووم، هیچ مۆڵەتێك پەیدانەبوو، بۆیە لەبەر شەکەتیی دوێنی شەوم، یەکسەر لێی نووستم.

نەمزانی چەندە بەڕێوەین، کە عەریفەکە خەبەری کردمەوە و داوای دابەزینی لێ کردم،

پرسیم: «دیاربەکرە»؟؟

لە وەلآمدا سەربازێکیان وتی:

(نەخێر، سلیڤانە)

شاری سلیڤان بوو. ئۆتۆبووسەکە لە نزیك چێشتخانەیەکەوە لای دا کە دیار بوو جێی ڕاوەستانی موسافیران بوو، چونکە چەندین ئۆتۆبووسی تری لێ ڕاوەستابوو.

بەعەریف و سەربازەکانم وت کەچی دەخوازن بخۆن و خۆشم زۆرم برسی بووبوو، بۆیە داوای سوویی جۆیەکم کرد.

عەریف، وەك پیشەی پێشووی قورسترین و چەورترین خواردنی هەڵبژارد. پشتی بەپارەوە نەدەیەشا، بەندە کیسە دار بووم.

کە عەریفەکە لە نان خواردن بووەوە سەیرێکی کاتژمێرەکەی مەچەکی کرد وتی:

«هێشتا کات ماوە و ئوتومبێلەکەش نیو کاتژمێری دی دەڕوا، بۆ سەرێك لە مەزاری (وەیسی قەرەنی) نەدەین»

ئەو ناوەم بیستبوو، زۆر کات کە لە سولەیمانی سوێند دەخورا، بەتایبەتی پیرەکان، ناوی ئەو زاتەیان دەهێنا، بۆیە بەخۆشحاڵییەوە وتم:

«بەڕاستی منیش حەز دەکەم»

(وەیسی قەرەنی) مشایەخێکی گەورە بوو. لە ڕاستیدا مەبەستی من – بەپلەی یەکەم – دۆزینەوەی هەڵێك بوو، بۆ هەڵاتن لە دەست سەربازەکان.

هەموو پێکەوە بەرەو مەرقەدی پیرۆزی ئەو مرۆڤە مەزنە ڕۆیشتین، زۆر دوور نەبوو چونکە هەر لە چێشتخانەکەوە قوببە و منارەی مزگەوتەکەی دەبینرا.

دیکۆر و جۆری بیناسازی مزگەوتەکە، نیشانەی گەورەیی و قەشەنگی زخرەفەی ئیسلامی نیشان دەدا، کاشییە شینەکانی قوببەی مزگەوتەکە، کە لەبەر تیشکی ڕۆژ دەبریسکانەوە هێندەی تر جەلال و عەزەمەتی دەدا بەمەزاری شەریفی ئەو مشاخەیە.

بەداخەوە، ژووری میحرابی، مەرقەدی پیرۆزی لەو کاتەدا، کلیل درابوو، بۆیە نەمانتوانی بچینە خزمەتی و هەر لە حەوشەکەی بەرامبەری ڕاوەستاین و عەریف و سەربازەکان کەوتنە خوێندنی دوعا و پاڕانەوە،

عەریفەکە سەری دانەواندبوو، سەربازەکان تفەنگەکانیان لەسەر زەوی دانابوو، دەستیان، بەرزکردبوو دەپارانەوە.

(هەلە) چەند هەنگاوێك بەرەو دواوە هاتم و خەریك بوو بەرەو دەرگای دەرەوەی مزگەوتەکە رابکەم کە لەناکاودا عەریفەکەدا – وەك پارانەوەکەی لەو کاتەدا تەواو بووبێ– ئاوڕی لێ دامەوە و منیش لە شوێنی خۆم ڕەق ڕاوەستام و دەستم بەرز کردەوە و بەدەنگی بەرز وتم:

«ئەی خوای گەورە. توو گۆڕی ئەو مشایەخە ڕزگارم بکەی»

عەریفەکە بەگومانەوە تێی دەڕوانیم، لەوە دەچوو هەستی بەم هەوڵە سەرنەکەوتووەم کردبێ، بەلاَم پێش خۆیان دام و عەریفەکەش هیچی نەوت.

کە گەڕاینەوە لای ئۆتۆبووسەکە، هەموو موسافیران جێی خۆیان گرتبوو، شوفێرەکەش لەسەر سووکان ئامادە بوو، تەنیا چاوەڕێی ئێمە بوون.

ئۆتۆبووسەکە کەوتەوە گەڕ، هەستم کرد عەریفەکە بەجۆرێکی تر سەیرم دەکات، ئەو موجامەلە و دۆستایەتییە لە جموجۆڵیدا ڕەنگی نەدەدایەوە. تفەنگەکەی خستە سەر ڕانی و ڕووی لوولەکەی تێ کردم، من هیچ خۆم تێك نەدا و پاڵم لێ دایەوە و چاوەکانم نووقاند، پاشماوەی ڕێکەی نێوان (سلیڤان) و (دیاربەکر) خۆم کرد بەخەوتوو، لە ڕاستیدا نەمدەویست عەریفەکە پرسیارم لێ بکات و لە هەوڵە سەرنەکەوتووەکەم بکۆڵێتەوە، کە گومانم نییە هەستی پێ کردبێ.

لای خۆمەوە تاوتوێی ئەو هەوڵەم دەکرد، هەڵێکی باش بوو گەر عەریفەکە لەو کاتەدا ئاوڕی نەدابایەوە. تۆ بڵێی جموجۆڵم – کە نائارامی پێوە دیار بوو، وای لێ نەکردبێ بەگومانەوە لە ڕەفتارم بڕوانێ. من لە لای خۆمەوە دەمویست هەڵسوکەوتم ئاسایی بنوێنێ، بۆ ئەوەی بتوانم فرسەتێك بهێنم. بەهەرحاڵ تا ئێستا هەوڵەکانم هەمووی نا سەرکەوتوون.

کەوتمە سەرزەنشتی خۆم و ڕەخنەم لە خۆم گرت. ئەمە سێ چوار هەوڵ و هەمووم لە کیس چوو. کێ دەڵێ هەلێکی ترم بۆ دەڕەخسێ؟

هەڵبەز و دابەزی ئۆتۆبووسەکە کە بەرێگایەکی نا ڕێکوپێکدا دەڕۆیی و وابزانم هەر ئەوەش بوو کە گێژی کردم و نوقمی نووستنی کردم.

لە ئانیشکی عەریفەکە بەئاگا هاتمەوە، دەوروبەر تاریك بووبوو، چونکە کە هەوڵم دا دەرەوە ببینم وێنەی خۆم لەسەر شووشەی پەنجەرەکە دی، سەیرێکی عەریفەکەم کرد.

هیلاك و شەکەت دەهاتە پێش چاو، لەوە دەچوو سەرتاسەری ڕێگاکە نەنووستبێ.

ئۆتۆبووسەکە دری بەتاریکی دەدا، کە ڕۆشناییەکی بەهێز لە پێشمانەوە دەرکەوت. عەریفەکە دەستێکی تێ وەژاندم و وتی:

«دیاربەکر... دیاربەکر...»

لە دیاربەکر دابەزین، عەریفەکە هەروەك جاری پێشوو پرسیاری لێم کردووە کە ئایا کامیان ئارەزوو دەکەم، بمبەن بۆ زیندانی (دیاربەکر) تا بەیانی، یان بچینە ئوتێل؟

بەڵگە نەویست بوو. کێ ئوتێل بەزیندان دەگۆڕێتەوە، بۆیە یەکسەر وتم «ئوتێل»

ئەو شەوە لە ئوتێل ماینەوە، هەموو پێکەوە لە ژوورێکدا نووستین، بۆیە هیچ هەوڵێکم نەدا. لە ڕاستیدا نەمدەویست بەهەوڵێکی سەرنەکەوتووی تر، ئەوەندەی تر گومانی سەربازەکان و عەریفەکە ڕابکێشم و ناچاریان بکەم کە کەلەپچەم بکەن.

بەیانی کە هەستاین، بەفر هێندە بەشەقامەکانەوە نەبوو، لە نەقلیاتێك، تەکسییەکمان گرت و عەریفەکە لە پێشەوە و دوو سەربازەکە و منیش لە دواوە سواربووین.

تا (ماردین) بەبێ دەنگی دانیشتین، نە عەریفەکە و نە سەربازەکان، هیچیان نەوت. تەنیا دەنگێك کە دەهاتە بەرگوێ، دەنگی گۆرانییەکی تورکیی ناساز بوو کە لە ڕادیۆی تەکسیەکەوە پچڕ پچڕ دەهاتە بەرگوێ.

سروشتی بەهاری نێوان (دیاربەکر) و (ماردین) سەرنجی ڕاکێشام. لەم ناوچانە بەفر هێندە نەباری بوو.

لە (ماردین) دابەزین و داوام کرد نان بخۆین. لە ڕاستیدا خۆم دڵم گیرابوو، هیچیشم پێ نەدەخورا. مەبەستم تەنیا قورس کردنی گەدەی پاسەوانەکان بوو.

تەکسییەکەمان ئیزن دا و لە چێشتخانەیەك لە ناوەڕاستی (ماردین)دا، لامان دا. عەریف و سەربازەکانم سەرپشك کرد کە هەرچی حەز دەکەن بیخۆن.

ئەوان سەرگەرمی هەڵبژاردنی خواردن بوون، چێشتخانەکەش پڕ بوو، بۆیە منیش کەم کەم پاشەکشەم بۆ کرد، بەناوی دەستشورییەوە. هاتمە دەرێ، خەریك بوو ڕابکەم کە عەریفەکە بەتوندی لاشانی گرتم و بەتووڕەییەوە تێی خوڕیم، سەربازەکان دەورەیان دام.

بەسەربازە تەرجومانەکەم وت:

«برا با بەهەڵە تێ نەگات تەنگەتاوم بۆ دەست شۆری دەگەڕێم»

نازانم عەریفەکە چەند ئەو پاساوەی سەلماند، سەری لەقاند و پێش خۆیان دام بۆ نێو چێشتخانەکە.

عەریفەکە تەواو بەگومانەوە سەیری دەکردم، و منیش جارویار دەستم بەسکمدا دەهێنا و خۆم ناڕەحەت پیشان دەدا.

کەوتنە خواردن، سەرنجم دا، یەکێك لە سەربازەکان نانی نەدەخوارد و هەر سەیری منی دەکرد. بڕێك کەوتنە قسە. کە عەریفەکە و سەربازەکە لە

نان خواردن بوونەوە، سەربازی پاسەوانم کەوتە نان خواردن.

پارەکەم بۆ دان. عەریفەکە سوپاسی کردم. لە ناوشار، کاتێك گەیشتینە بەر نەقلیاتێك، عەریفەکە تەکسییەکی بەکرێ گرت، گوێم لێ بوو وتی:

«سلوپی؟»

یا ئیلاهی (سلوپی) دوایین مەنزڵمە و پاش ئەوە تەسلیمی (ئیبراهیم خەلیل)م دەکەن. دەبێ هەر چۆنێك بێت لەم ماوەیەدا شتێك بکەم.

سەربازەکان و عەریفەکە، پێش ئەوەی سوار بن، کەوتنە مقۆ مقۆ و پاشان کەلەپچەیان کردم و لە پشتەوە، لە نێوان هەردوو سەربازەکەدا، دایان نیشاندم. عەریفەکەش لە پێشەوە دانیشت.

کاتێك تەکسی کەوتە ڕێ، عەریفەکە زوو زوو ئاوڕی دەدایەوە – و شتێکی بەسەربازەکان دەوت. –لە ڕاستیدا نەمدەزانی باسی چی دەکەن، بەڵام دیار بوو باسی من و مەسەلەی ئاگاداری من بوو.

نەمدەزانی چی بکەم، تازە دەستیشم کەلەپچە کرابوو، بۆیە سەرم دنگەی دەهات و بیرم بۆ هیچ نەدەچوو.

هەوڵە سەرنەکەوتووەکانم، دۆخەکەی گەیاندە ئەوەی کەلەپچە بکرێم. جا بەکەلەپچەوە چی دەکرێ و چ هەوڵێك لەم ماوە کورتەدا دەتوانرێ بدرێ؟

کات لە بەرژەوەندی من نەبوو، هێدی هێدی دەڕۆیشت و ماوەش تا دەهات کورتتر دەبووەوە. بەلاچاو سەیری کاتژمێرەکەی مەچەکم کرد. یەکی پاش نیوەڕۆ بوو.

بیرم بۆ پیلانێکی دیاریکراو نەدەچوو، بەتایبەتی کەلەپچە کردنەکەم تەواو وورەی پی بەردابووم، دەمویست، بەشێوەیەك، پێیان بسەلمێنم کە کەلەپچەکەی دەستم بکەنەوە بەڵام هیچ پاساوێکی بەجێم بۆ نەدەدۆزرایەوە.

دیاره هەوڵە زەقە سەرنەکەوتووەکانیشم مۆڵەتی قسەکردنی پێ نەدەدام.

ئوتۆمبێلەکە دەڕۆیشت و سیمای دزێوی مەرگیش، تا دەهات، لێم نزیك دەبووەوە. چاوم نووقاند، سەراپای ڕووداوەکانی تەمەنم پچڕ پچڕ دەهاتەوە پێش چاو، بۆیە چاوم هەڵبڕی و سەیری دەوروپشتی خۆم کرد، هەردوو سەربازەکە ڕەق، بێ جووڵە، لە تەنیشتمەوە، دانیشتبوون. سەیری لای ڕاستم کرد. تەلبەندەکانی سنووری تورکی سووری هاتە بەرچاوم، کە لە هەندێك شوێندا گەیشتبوونە سەر ڕێگاکە و بەئاشکرا قوولەی پاسەوانەکانی تورکیا دەبینران. تین و وزە و گوڕێك بەگیانمدا، تەزووی هێنا و دەستم خستە سەرسکم بەتوندی هێڵنجێکم دا. سەربازەکان و عەریفەکە بەسەرسووڕمانەوە تێیان ڕوانیم و منیش چەند جارێك هێڵنجم دا، لە ڕاستیدا دەمویست بەناوی ڕشانەوە وەئوتومبێلەکە ڕابگرن و هەوڵێکی ڕاکردن بەرەو تەلبەندەکانی سنووری (سووری) بدەم. عەریفەکە ئاوڕی دایەوە وتی:

«چیتە؟» بەدەست ئیشارەتم بۆ سکم کرد، بۆیە ئوتومبێلەکەی ڕاگرت. دایانگرتمە خوارێ، هەوڵی ڕشانەوەم دا و لە ژێرەوە سەیری تەلەبەندەکانم دەکرد. پەرینەوە لەو تەلبەند بەرزانە و بەبەرچاوی پاسەوان و سەربازەکانی دەوروپشتمەوە کاری کردە نەبوو، بۆیە هیچ هەوڵێکم نەدا.

شانیان گرتم و بۆ ناو ئوتومبیلەکە هێنامیانەوە. ئوتومبیلە کەوتەوە ڕێ و منیش جارویار هێڵنجێکم دەدا و خۆم بەتەواوی خستبووە دۆخی نەخۆشێکەوە، وابزانم سەربازەکان بڕوایان کردبوو، کە تەندروستیم بەڕاستی تێك چووبێ. گەیشتینە شاری (جەزیرە) و لە ناو شاردا، کاتێك گەیشتینە سەنتەری شار، هێڵنجێکی تری بەهێزم دا و پاشان بەعەریفەکم وت:

«تکا دەکەم تەندروستیم زۆر ناتەواوە و بەشکو مۆڵەت بدەن لە چاخانەیەك چایەك بخۆمەوە...»

عەریفەکە برێك تێی ڕوانیم، منیش خۆم هێنابووە حاڵی جاو. ئوتومبێلەکەی لە بەردەم چایخانەیەکدا ڕاگرت و فەرمانی دابەزینی دا، دوایین مۆڵەتم بوو، سەرم بەدەوری خۆمدا گێڕا، تابلۆی (سلوپی) هاتە بەرچاوم. ڕاچەنیم، تەنیا بیست و پێنج کیلۆمەتری مابوو. لە چایخانەکەدا داوای چامان کرد، عەریفەکە سەرنجی دا کە ناتوانم بەکەلەپچەوە (چا) بخۆمەوە بۆیە کلیلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و کەلەپچەکانی کردەوە. عەریف و سەربازەکان سەرقاڵی چا خواردنەوە بوون، دەستم کرد بە گیرفانمدا و پەنجا هەزار لیرەی تورکیم دا بەچایچییەکە. عەریفەکە ڕاپەڕی و کەوتە تێخوڕینی چایچییەکە و دەیویست پارەکەی لێ بستێنێتەوە. لەوە دەچوو زیاد لە پێویستم دابێتی چونکە مشتومڕێکی توندوتیژیان بوو. هەلم لە کیس خۆم نەدا، دەستەکانم ئازاد بوون، لە چاو ترووکانێکدا پالم بەدەرگای چایخانەکەوە ناو، ڕووەو جیهانی ئازاد هەڵاتم.

لە چوار ڕێیانی شاردا، نزیکەی سەد مەترێك، دوای ڕاکردن، کەوتم بەسەر عارەبانەیەکی دەستیی لەعنەتیدا و عەریفەکە و سەربازەکان سواری سەرم بوون، ئیدی کار لە کار ترازاو، بەهەموو هێزم بەرگریم لە خۆم دەکرد، شەڕێکی نا بەرامبەر بوو، دوو سەرباز و عەریفێك پڕ چەك و منی بێ چەك. ئەوان هەوڵیان دەدا کەلەپچەکە بکەنەوە دەستم و منیش، بەهیچ شێوەیەك مۆڵەتم نەدەدا، پەلەقاژێی بەردەوام بوونی ژیان بوو، هێزێکی خوایی بەلەشمدا ڕۆ چوو بوو، هەرچەندیان دەکرد نەیاندەتوانی کەلەپچەکە بکەنەوە دەستم و منیش پەلاماری تفەنگی عەریفەکەم دا و هەوڵی ستاندنیم دەدا. سەربازەکان بەقۆناغە تفەنگ دەیاندا بەشان و پشتما و هەوڵی ئەوەیان دەدا دەستم لە تفەنگی عەریفەکەیان بەردەن. هێزی من و عەریفەکە، قابیلی بەراورد نەبوو، ئەوێکی پەنجا ساڵە لەگەڵ مندا دەرنەدەچوو.

یەکێك لە سەربازەکان تاکێك کەلەپچەی لە مەچەکی چەپم گیرکرد و

منیش هەر بگرەو بەردەم بوو لەگەڵ عەریفەکەدا و دەستم هێند لەیەك دوور خستبوو کە تاکی کەلەپچەکە نەیگاتێ. شەڕی نێوان مردن و ژیان بوو، ئەوان دەیانویست بەرەو مەرگم بەرن و منیش هەوڵم بۆ ژیان دەدا.

لەو کاتەدا ئەفسەرێکی تورك پەیدابوو، خەڵکی ناو شار، تا دەهات، لە دەورمان کۆ دەبووە و پاسیڤانە سەیری ئەو شانۆ ترسناکەیان دەکرد. یەکێك لە ناو خەڵکەکەدا غیرەت گرتی و هاواری کرد:

بۆ دەیانەوێ بتگرن؟.

دەستم هێندەی تر لە تفەنگی عەریفەکە گیرکرد و منیش پڕ بەدەم هاوارم کرد:

«پێشمەرگەم!»

جەماوەرەکە وردە وردە خرۆشا و کەوتنەوە جووڵە، بەڵام بەشداریان لە شەڕەکەدا نەکرد. گوێم لە دەنگی خەڵکەکە بوو کە دەیانوت:

«بەسە. بەسە. هەی کافرینە»

لە ژێر قۆڵی عەریفەکەوە چاوێکی پەلەم بەناو خەڵکەکەدا خشاند، ئەفسەرەکە دەمانچەکەی دەرهێنا و دەستی کرد بەتەقە بەهەوادا. ئەو رەفتارە جەماوەرەکەی بەتەواوی خرۆشان و منیش هاوارم کرد:

«پێشمەرگەم، پێشمەرگەی بارزانی»

ناو هێنانی بارزانی، خەڵکەکەی تەواو خرۆشاند و تەوژمێکی بەهێزی بەغیرەتی خەڵکەکە داو و یەکسەر پەلاماری سەربازەکانیان دا و منیان لە چنگی سەربازەکان و عەریفەکە دەرهێنا. منیش هیچ هەڵم لە کیس خۆم نەدا و کەوتمەوە ڕاکردن.

بوو بەتەقە، ئاورێکی پەلەم دایەوە، عەریفەکە بەچیچکانەوە تەقەی لێ دەکردم، هیچ مۆڵەتی بیرکردنەوەم نەبوو، بەخۆم وت:

«ڕاکە. دواین هەلە»

لە ڕاستیدا بەجۆرێك ڕام دەکرد، وەك لە بۆربۆرینێکی جیهانیدابم. ئارەزووی ژیان هەنگاوی بۆراق ئاسای پێ دەنام، ئاورێکی تری پەلەم دایەوە.

عەریفەکە بەتەقەوە بەدوامدا ڕای دەکرد و منیش هەر هێزم بەخۆم دەدا، گیزی گوللە بەلاسەروشانمدا گڤەی دەکرد. هەموو ساتێ چاوەڕێی چزانی گوللەیەك بووم، کە سەرم یا لەشم بسمێ. گەیشتمە سەری کۆلانێك و ئاورێکی ترم دایەوە. پەنجا مەترێك پێش عەریفەکە کەوتبووم، بەکۆلانەکەدا لام دا و لەسەر سووچی کۆلانی دووەم دەرگای مالێك لەسەر پشت بوو، بۆیە بێ بیرکردنەوە خۆم خزاندە ژووری. لە پشت دەرگاکەوە خۆم مەلاس دا. دەرگاکەم دانەخست. هەناسە برکێم بوو، خیزەی سنگم دەهات و شەکەت بووبووم. پشوویەکم دا و کەمێك هاتمەوە سەرخۆم. عەریفەکە بەتەپەتەپ بەکۆلانەکەدا ڕای دەکرد. هەستی بەبوونم نەکرد. هەروا لە پشت دەرگاکەوە ڕاوەستابووم کە سەرنجی حەوشەی مالەکەم دا و بەئەسپایی چوومە حەوشەکەوە.

ژنێك لە یەکێك لە ژوورەکانەوە دەرپەڕی و بەتووڕەییەوە پێی وتم:

چی دەکەی؟

دەنگی تەقەی تفەنگ، لە ناو شارەوە، بەئاسانی دەکەوتە بەر گوێ. نەمزانی لە وەلامی ئەو خانمە قەشەنگەدا چی بلێم، بۆیە مەچەکم بەرز کردەوە و کەلەپچەکەم نیشان دا، کە زیاتر ئاگری گرت و داوای چوونە دەرەوەمی لێ کردم. زۆرم هەولدا کە نەچمە دەرێ، بەلام بێ سوود بوو. زۆر دەترسا لەوە دەچوو هەلوێستی لەو بابەتەی، لە ژیانیدا، نەدی بێ و بتوانێ زیندانییەکی ڕاکرد و بشارێتەوە. وتووێژی نێوانمان بێ سوود بوو. ئەو سووربوو لەسەرئەوەی مالەکەیان بەجێ بهێلم، بۆیە منیش زۆر لەسەری

نەڕۆیشتم و بەدیواری ماڵەکەدا هەڵزنام و بازم دایە کۆڵانی پشتەوە. ماوەیەك ڕاوەستام، لە ڕاستیدا نەمدەزانی چی بکەم، کەسم نە دەناسی و شارەزای هیچ شوێنێك نەبووم. چاوم گێڕا، کرێکارێك لەو بەرمەوە خەریکی زەوی هەڵکەندن بوو، دیار بوو بناغەی خانوویەك ئامادە دەکرێ. دەنگی تەقە بەئاسانی دەبیسترا، شار شلەژا بوو، کرێکارەکە چاوی پێم کەوت، خەریك بوو ڕا بکا، کە فریای کەوتم و خۆم فڕێ دایە چاڵەکەیەوە، دەستیم گرت و کەلەپچەکەم نیشان دا و وتم:

(ئەم تەقانەی دەیبیستی؟ بۆ منە)

لە سەرەتادا لەوە نەدەچوو حاڵی ببێ، چونکە زۆر بەترسەوە تێی دەڕوانیم. کەمێك هاتبوومەوە سەرخۆم و لە چاڵەکەدا دانیشتم و بەکرێکارەکەم وت:

«من لە دەست جەندرمەی تورك هەڵاتووم، پێشمەرگەم و ئەوان دەیانەوێ تەسلیمی عێراقم بکەنەوە. فریام کەوە.، کەسێ لەم وڵاتەدا ناناسم»

کرێکارەکە سەری بۆ ڕاوەشاندم و پەلی گرتم لە چاڵەکە هێنامیە دەرێ. ماوەیەکی کورت پێکەوە ڕۆیشتین و گەیشتینە بەردەم مزگەوتێك کرێکارەکە وتی:

«بڕۆ نێو ئەو مزگەوتە تا من خەڵکت بۆ دێنم»

هیچ لەسەری نەڕۆیشتم و خۆم کرد بەژووری مزگەوتەکەدا. لە حەوشەکەدا، کەسم بەدی نەکرد تەنیا پیاوێکی پیر لە ژوورەوە بوو، کە ئەویش بەرەو دەر دەهات.

کابرا هیچ سەرنجی نەدامێ و منیش، بێدەنگ، لە ژووری نوێژکەراندا دانیشتم.

چاوم بەدار و دیواری ژوورەکەدا گێڕا، جبە و مێزەرێ، کە لە سووچی

میحرابەکەدا هەڵواسرابوو، سەرنجی ڕاکێشام. لەوە دەچوو، بەتایبەتی، بۆ من دانرابێ، بۆیە یەکسەر دامگرت و پۆشیم. مێزەرە سپییەکەشم نایە سەرم، لە مەلایەکی تەواو دەچووم و لە میحرابەکەدا. لە شوێنی نوێژی مەلا، لێی دانیشتم و پاش ساتێك قورئانێکم داگرت، خستمە سەر تەختەیەکی ڕاست و چەپ کە تایبەتی بۆ خوێندنەوەی قورئان و سەرم بەسەر قورئانەکەدا شۆڕکردەوە و لەبەر خۆمەوە وتم:

«ئەی خوای گەورە، من چیم کردووە کە تووشی ئەم هەموو دەردی سەرییە ببم؟»

هەستم دایە خۆم. دەوروبەرم تەواو کشومات بوو، هیچ دەنگێك نەدەبیسترا. ماوەیەك هەروا دانیشتم و کەوتمە بیرکردنەوە و لە دڵی خۆمدا وتم:

«تۆ بڵێی ئەم کرێکارە خەبەرم لێ نەدا؟ کێم بۆ بانگ بکا و کێ لەم وڵاتە غەریبە دا من دەناسێ»

خەریکی تاوتۆی بیر و ڕاکانم بووم، کە جموجۆڵێك لە حەوشەکەدا پەیدا بوو، ترسم لێ نیشت تۆ بڵێی سەربازەکان نەبن. دەرگای ژوورەکە کرایەوە گوێم لە مقۆ مقۆ بوو، نەم وێرا سەر هەڵبڕم. لەشم نیشتە سەر ئاو و چاوەڕێی ئەوە بووم کە قۆناغە تفەنگێك بیدا بەسەرما. دەرگای ژوورەکە جارێکی تر کرایەوە گوێم لێ بوو پرسیاری کرا:

«کوا؟»

کە گوێم لە زمانی کوردی بوو، ئاوڕێکم دایەوە، کرێکارەکە و دوو کەسی تر بوون بەخۆشحاڵییەوە کەلەپچەکەم نیشان دان و وتم:

– (ئەوەتام)

دۆخی دەروونیم بەبینینی کرێکارەکە گەشایەوە. دوو کەسەکە خۆیان

پێشکەش کردم و قەمسەڵەیەکیان دامێ، جبە و میزەری مەلام داکەند و دوایان کەوتم. بەسەر دیواری مزگەوتەکەدا بازمان دا. ئوتومبێلێکیان ڕ اگرتبوو، کە سوار بووین، یەکێکیان کە برێك گۆشتن و تێکسمڕاو بوو وتی:

«هەڤاڵ تۆ نەترسێیت، تۆ ئێستا لای ئێمەیت»

ئوتومبێلەکە بەکۆلانە پێچاوپێچەکانی (جەزیرە)دا ڕێی دەکرد و لە بەردەم ماڵێکدا ڕایان گرت، بۆ من زیاتر لە خەو دەچوو. کردەیی و شارەزایی لە جموجۆڵی هەردوو برادەرەکە، بەئاشکرا، ڕەنگی دەدایەوە. بەڕاستی پیاوی کردە و لێهاتوو بوون.

لە ژوورەوە دانیشتین پاشان یەکێکیان وتی:

«با تۆزێ تاریك دابێ، بۆ شوێنێکی تر دەتگوێزینەوە»

هەردوو برادەرەکە کەوتنە پرسیارکردن، چۆنیەتی دەستگیرکردنم. هەموویم بۆ باس کردن، ئەوانیش خۆشحاڵیی خۆیان لە ڕزگاربوونم نیشان دا. کەلەپچەکە، لە ڕاکردنەکەمدا، چەند گرێیەك توندتر بووبوو. مەچەکم ئازاری دەهات بەڵام باسم نەکرد.

شەو داهات و دەوروبەر تاریك بوو، هاتینە دەرێ و بەپێ بەکۆڵانە باریکەکانی (جەزیرە)دا، بە بێدەنگ دەڕۆیشتین. خۆشبەختانە گڵۆپی کۆڵانەکان نەبوون، بێ ترس، بەتایبەتی من، ڕێمان دەکرد.

لە بەردەمی ماڵێکی گەورەدا وەستان، یەکێکیان چووە ژوورێ و پاش ساتێ هاتە دەرێ، ئیشارەتی چوونە ژوورەوەی بۆ کردین.

هەر کەدانیشتم هەواڵی مشارێکی ئاسنم پرسی. لە ڕاستیدا، تەنیا ڕێگە، بۆ کردنەوەی کەلەپچەکەی مەچەکم، مشاری ئاسن بوو. ماڵەکە میوانداریيەکی باشیان کردم، هێندەی نەبرد مشارێکی ئاسنیشیان پەیدا کرد. کەوتنە برینەوەی کەلەپچەکەم. پەنجەکانی دەستم ئاوسا بوون و

کەلەپچەکەش بەتەواوی لە مەچەکم گیر بووبوو، بەڕادەیەك کە تەواوی دەستمی ئاوساندبوو.

تا مشارەکە زیاتر گوشاری دەخرایە سەر، دانی کەلەپچەکە زیاتر ڕۆدەچوو. دەستم سوور بووبووەوە و تەواو خوێنی تێزابوو، ئەگەرچی بەبەردەوامی مشارەکەیان بەکەلەپچەکەدا دەهێنا کەچی هیچ ئەنجامێکی نەبوو. پۆلای کەلەپچەکە هێند بەهێز بوو، کە مشارەکە جاروبار بریسکە و پریشکی دەدا، بەڵام بێ سوود بوو. خاوەن ماڵ و هەردوو برادەرەکەم تەواو نیگەران بوون کە گەر مشاری ئاسن ئەم کەلەپچانە نەپسێنێ چی دەیشکێنێ؟

من لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستم ئازارێکی بێ وێنەی دەدام، ناچار بووم کە داوای بەردەوام بوونیان لێ بکەم چونکە لەوە زیاتر چاری تر نەبوو.

سەرنجم دایە مشارەکە، وردە وردە کەلەپچەکەی دوو توێ دەکرد. پروشەی ئاسن مایەی دڵخۆشکەریی من و دەرویەرمان بوو. هەوڵدانەکەمان بێ ئەنجام نەبوو.

ئەوان لەسەر بڕینەوەی کەلەپچەکە بەردەوام بوون و منیش هەر بۆ لە بیربردنەوەی ئازاری دەستم، چاوم بەژوورەکەدا دەگێڕا، وێنەی بەرزانیم لە چوارچێوەیەکی قەشەنگدا بەدی کرد، لە ڕاستیدا سەرم سووڕما، وێنەی بەرزانی، ئاوا بەئاشکرا هەڵواسرێ، جێی ڕامان بوو.

چۆن دەیانوێرا. لە تورکیادا کە هەموو شتێك دەربارەی کورد، قەدەغە بوو، هەڵواسینی وێنەی بەرزانی ئەوپەڕی ئازایەتی و چاو نەترسی دەنواند.

لە کاتژمێری یەکی شەودا کەلەپچەکەیان بڕییەوە، دوا قۆناغەکانی گەلێ سەخت بوو، بەڵام بەپسانی کەلەپچەکە هەموو گیانم ئاسوودە بوو. ئاوسانی پەنجەکانی دەستم وردە وردە دەنیشتەوە.

لە ڕۆژەکانی داهاتوودا، هەر شەوە و دەیانبردمە ماڵێك و پاشان لە ژێر زەمینی ماڵێکدا جێگەیان بۆ ساز کردم. یەکێك لە برادەرەکانم کە ڕۆژانە سەردانی دەکردم و دەنگوباسی دەرەوەی بۆ دەهێنام وتی:

«لەم ڕۆژانەدا بەرەو سووریا دەتبەین»

هەواڵێکی دڵخۆشکەر بوو، منیش هاتبوومەوە سەرخۆم و، گوڕوتینی نوێم تێزابوو.

لەبەرئەوەی هیچ جۆرە کتێبێك لە ژێر زەمینەکەمدا بەکوردی پەیدا نەدەبوو، زۆربەی کاتەکانم بەوەرزشەوە بەسەر دەبرد، سەدان شناوم کرد.

دەمەو بەیانییەك برادەرەکانم هاتنە لام و پێیان وتم:

«خۆت ئامادە بکە ئەمڕۆ دەتبەین بۆ (نەسیبین)»

(نەسیبین) شارێکی سەرسنوور بوو، لەگەڵ قامیشلیدا، کە شارێکی (سووریا)یە، هاوسنوور بوو.

بەدووروودرێژی باسی پیلانەکەیان بۆ کردم، کە بریتی بوو لەوەی ئەوان بەئوتومبێلێك لە پێشەوە بڕۆن و منیش لەگەڵ شوفێرێکی لاودا، کەزبکوزیتیی پێوە دیار بوو، سواربم و لە دوایانەوە بڕۆین یەکێك لە برادەرەکان وتی:

«ئێمە چەکدارین و لە پێشتانەوە دەڕۆین، زاڵگەکانی دەرەوەی (جزیرە)مان تاقیکردووەتەوە و ئێستا کەس ڕاناگرن و گەر ڕایان گرتین، ئەوا ئێمە دەیکەین بەتەقە و ئێوە چاوەڕوان مەبن و دەرچن»

لەگەڵ شوفێرە لاوەکەدا سوار بووم و ئەوانیش لە پێشمانەوە کەوتنە ڕێ.

دڵم لێ دەدا و لە دڵی خۆمدا وتم:

«دوا قۆناغی ڕزگاربوونمە، تۆ بڵێی بەسەلامەتی دەربازبم؟

شوفێرەکە کە دیار بوو هەستی بەنیگەرانیم دەکرد وتی:

«هیچ خەمت نەبێ، ئەم بەیانییە دووجار ڕێگای (جزیرە) و (نەسیبین)م تاقیکردووەتەوە هیچ نییە».

ڕۆژێکی تەماوی بوو، کە بۆ من نیشانەی دڵنیایی و ئاسوودەگی دەروون بوو.

وردە وردە لە زاڵگەی جەزیرە نزیك بووینەوە بۆیە بەوردی سەیری ڕێگەی بەردەممان دەکرد. شۆفێرەکە وتی:

«هەر ئەم زاڵگەیە هەیە. ئیتر تا (نەسیبین) هیچمان نایەتە ڕێ.

شۆفێرەکە خۆی پێشکەش کردم. لە ڕاستیدا شۆفێر نەبوو، بەڵکو هاوەڵ و دۆست و هاوخەباتی برادەرەکانم بوو.

تەواو لە زاڵگەکە نزیك بوو بووینەوە و من بەئاسانی جەندرمەی سەر ڕێگاکەم دەدی.

تومبێلەکەی پێشەوەمانیان ڕانەگرت و ئێمەش بەدوایاندا! یا ئیلاهی هەستم بەچ خۆشحاڵییەك دەکرد.

شۆفێرەکە، هەر بەدەربازبوونمان لە زاڵگەکە، یەکسەر ڕێکوردی تۆمبێلەکەی کردەوە و دایە قاقای پێکەنین و وتی:

«نەموت ڕامان ناگرن»

خۆشحاڵیم وەسف نەدەکرا و سوپاسی ئازایەتی ئەویشم کرد. لە ڕاستیدا کارێکی جوامێرانە بوو، گواستنەوەی زیندانییەکی ڕاکردوو، کارێکی ئاسان نەبوو.

خواحافیزیمان لە شوفێرەکە کرد و سوپاسی ئازایەتی و یارمەتیدانیم کرد. دوای نیوەڕۆ برادەرەکانم گەڕانەوە، پیاوێکی تریشیان لەگەڵدا بوو،

کە بە(حاجی) پێیان ناساندم و پانتۆڵێکی کاوبۆی و کراسێکی نوێشیان بۆ هێنابووم وتیان:

«ئەم جلانە بپۆشە و هیچ نیگەرانیش مەبە. پارەمان بەسەربازەکانی سەرسنوور داوە. وادەزانن خەڵکی «سووریا»یت و ئەم برادەرەش».

ئیشارەتیان بۆ پیاوەکە کرد.

«ئەوا تا نزیك تەلبەندەکانی سەرسنوور لەگەڵتا دێ»

لەسەری کۆڵانێکدا (حاجی) ڕاوەستا و دەستی بۆ قوللەی پاسەوانی تەلبەندەکان درێژ کرد وتی:

«هەر ئەم تۆزەمان ماوە، ترست نەبێ، ئێستا من لە پێشەوە دەڕۆم بۆ لای تەلبەندەکان و بۆت بەرزدەکەمەوە و تۆش یەکسەر بێ ڕاوەستان تێپەڕە.»

سەیری پاسەوانی نێو قوللەی سەر تەلبەندەکانم کرد. پشتیان لێمان بوو. بێ ورتە دوای (حاجی) کەوتم و دڵم لەسەر هەزار لێ دەدا، هەزاران بیرۆکە بەمێشکمدا دەهات و دەچوو. (حاجی) تەلبەندی سنووری بۆ بەرزکردمەوە و منیش بێدەنگ خۆم کرد بەژێریدا و چوومە ئەودیو، تەلەبەندی دووەم، دەبوو خۆم بەرزی بکەمەوە.

ئاورم لە (حاجی) نەدایەوە، ماوەی نێوان هەردوو تەلەبەندەکەم بەئەسپایی بڕی و کاتێك گەیشتمە بەر تەلبەندی دووەم، ئاوڕێکی بروسکە ئاسام لە (حاجی)و پاسەوانی تەلبەندەکان دایەوە. پاسەوانەکان روویان لە لایەکی تر بوو. (حاجی) بەپەلە هێمای سەرکەوتنی بەپەنجەکانی نیشاندام و لە چاو ون بوو.

تەلەبەندەکانم بەرزکردەوە، لە ڕاستیدا چاوەڕێی ئەوە بووم کە فیشەکێك لە پشتەوە لەناکاودا، تەپڵی سەرم هەڵگرێ. زۆرم دەربارەی کوشتاری ئەم سنوورە بیستبوو. خۆم بەئەسپایی خستە ژێر تەلبەندەکەوە و، چوومە ئەودیو.

